المعهد العالمي للفكر الإسلامي

(٩)

# دور حرية الرأي
## في الوحدة الفكرية بين المسلمين


تأليف:
د. عبد المجيد النجار

ترجمة:
عفان الشيخ صديق سركتي


پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(٩)

# ڕۆڵی ئازادیی ڕادەربڕین
## لە یەکبوونی هزری نێوان موسوڵماناندا


نووسینی:
د. عەبدولمەجید نەجاڕ

وەرگێڕانی:
عەفان شێخ صدیق سەرگەتی

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(٩)

# ڕۆڵی ئازادیی ڕادەربڕین
# لە یەکبوونی هزری نێوان مسوڵمانانـدا

نووسینی:

د. عەبدولمەجید نەججاڕ

وەرگێڕانی:

عەفان شێخ صدیق سەرگەتی

چاپی یەکەم

١٤٣١ی کۆچی　　　٢٠١٠ی زاینیی

## مافی لەچاپدانی پارێزراوە


ناوی کتێب: ڕۆڵی ئازادیی ڕادەربڕین لە یەکبوونی هزری نێوان مسوڵماناندا.

نووسینی: د. عەبدولمەجید نەججاڕ.

وەرگێڕانی: عەفان شێخ صدیق سەرگەتی.

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ژمارە (٩).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٧٦٤)ی ساڵی (٢٠١٠)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٠.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (٥٠٠) دانە.



ئیمەیلی پەیمانگا: **iiitkurdistan@yahoo.com**

# پێشەكیی دكتۆر تەها جابر عەلوانی

## ا مد رب العا والصلاة والسلام على خا النبي وعلى آله وصحبه ومن اهتدى ديه إ يوم الدين وبعد.

خوای گەورە ئەم مرۆڤەی بە جوانترین شێوە بەدیهێناوە، كردوویەتی بە جێنشین لەسەر زەویدا و ئاوەدانكردنەوە و وەبەرهێنانی خێروخێراتەكانی پێ سپاردووە، كردوویەتییە بەرپرسی پیادەكردنی دادگەری لەسەر زەویدا، بۆ ئەم مەبەستەش ئەوەی لە بووندایە بۆی رامكردووە، هەتاو و مانگ، زەمین و ئاسمان، چوارپێ و دارو درەخت، گژو گیاو دەریاو رووبارو زەریاكان، هەموویان لە خزمەتیدان، لە ژێر دەسەڵاتو ویستی ئەودان، بۆ بەدەستهێنانی هەرشتێ لە نێو ئەوانەدا نیازی بەكێشمەكێش و بگرەو بەردە نییە لەگەڵیاندا، چونكە بۆ ئەو خولقێنراون و لە پێناو ئەودا هەن و دەستەمۆی ویستو ئیرادەی مرۆڤن.

مرۆڤیش تەنها ئیش وكاری وەبەرهێنانی پەرچەكەیانەو رامكردنیو چنینەوەی بەروبوومەكانیان، چونكە خوای گەورە بەدیهێنانو دروستكردنیان لە ئەستۆی خۆی گرتووە، ئەو خوایەی شێوازی بەدیهێنانی هەموو شتێ لە دەسەڵاتی خۆیەتیو پاشان رێنموونیشی كردووە، دروستكراوی خوای گەورە كە هەموو شتێكی بە جوانیو تەواوی بەدیهێناوە، ئەركی راسپاردەییو جێنشینایەتی بە ئاكام ناگات تەنها لەسەر دەستی بە توانایەكی سەرپەشك كراو نەبێ، لەبەرئەوە مرۆڤ كامڵ كراوە بە توانا بە هەموو شێوازو جۆرەكانییەوە لەگەڵ پێدانی پێشیرو سەرپشك بوون، چونكە ئەگەر وانەبێ باربووكردنی شتێكی پووچگەراییە، چۆن دەگونجێ دەستەوسانێ ئەركی لەسەر دابنرێ شكاوو دەستەپاچەیەك و ناچارێك فەرمانی بەسەردا بدرێ و داوای ئەركێكی لێ بكرێ لە شتێكدا ویستی خۆی تێدا نەبێت، لەوەیش گەڕێین كام گەورەییو رێزو پاداشتە مانای دەبێت كاتێ ئەركێكی ئەنجامدابێت لە رووی زۆرو ناچارییەوە بێت؟!

رزگارکردن‌و ئـازادی کرۆکـی پـەیامی ئیسلام‌و تـەوەری بیروبـاوەڕو یاسـادانان بـوون، ئـەم تایبەتمەندییـەش هـەژاران و سـتەملێکراوو ئـازاردراون، هـە سـتیان پێدەکرد، لەبەرئەوە بە هەموو ئەقڵ‌و دڵ‌و بوونیان روویان لەم ئاینـە کـردو بوونـە هـەڵگری مەشـخەڵی یەکـەمی ئـەم ئایینـە، هـەروەها سـتەمکاران و خوێنمـژانیش هەسـتیان بـەم راسـتییە کـرد، هەربۆیـە بەرپەرچـی ئـەم پەیامـەیان دایـەوەو بـەرەنگاری بوونـەوە، چـەندین کۆسـپ‌و ئاسـتەنگیان لەبەردەمـدا دروسـت کـرد، ئیعلانـی شـەڕیان دژ کـرد بـە هـەموو شـێوازێك، تـا خـوای گـەورە بەنـدەی خـۆی سەرخست‌و عیززەتی بـە سـوپای ئیـسلام بەخـشی و تـەنها خـوای گـەورەش بـوو سوپای پارتەکانی شکست پێهێنا.

ئیمان‌و بڕوا، لە چوارچێوەی ئیسلامدا هۆکارێکی گـەورە بـوون بـۆ رەهـابوونی عەقڵ‌و ویژدان‌و دەروونـی مـرۆڤ، بـە هـۆی بـڕواوە عـەقڵ رزگـاری بـوو لـە هـەموو بیرێکـی پـووچ‌و دڕدۆنـگ‌و فـشارو سەرچـاوەکانی گومڕابـوون، کردییـە عـەقڵێکی ئازادی کار بەڕێوەبەرو بیرخـوازو شـیکارو هەڵهێنجێنـەر، پـەیڕەوێکی رێك‌و پێکـی هەیە ئازادە لە وەرگرتنی مەعریفەت یـا وەرنـەگرتنی، ئـیتر خـوێنراو یـا بینـراو یـا بیسراوو یا هەڵهێنجنراو بێ، ئەم مەعریفەتـەش درابێتـە پـاڵ جیهـانی میتـافیزیکی یان جیهانی مادە کوێرکوێرانە وەرناگیرێ، بە دوای بەڵگـەو سـەلماندندا دەگـەڕێ، هەموو جۆرەکانی مەعریفەت دەخاتە ژێر ئەم پەیڕەوەوە بەبێ جیاوازی، نەك هـەر ئەمە خوای گەورە زۆرێك لەو بابەت‌و شتانەی ئامـادە کـردوون تەقـدیری کـردوون، لەوانە ناردنی پەیامبەرانی پەیوەست کردووە بە بەڵگـەو سـەلماندنەوە تـا خـەڵکی بیانوویان بۆ لای خوا نەمێنێ، پێغەمبەرانیشی بە گەلـەك بەرچـووەوە نـاردووە تـا ببنـە بەڵگـەی پێغەمبـەر بوونیـان بـۆ ئـەو ئوممـەت‌و خەڵکانـەی کـە ئـەوانی بـۆ نێردراون.

هەروەها ئیمان‌و ویژدان‌و دەروونی بڕواداری ئازاد کردووە، ئازادییەکی تـەواو و گشتگیر لە هەموو ئەو رەفتارانەی کە پێدەچێت ببنە هۆی بەسـتنەوەی مـرۆڤ یـان

لەكارخستنی تواناو ئەركەكانی، تـا ئـەم مرۆڤـە بـە هـەموو تواناكانییـەوە هـەنگاو هەڵنێ لە هەموو بوارەكانی فیكـریو ئـاوەدانی و شارسـتانی، بكۆشـێ و داهێنـانی هەبێت بۆ دەرخستنی ئاسەواری تواناكانی بەدیهێنەر (جل شأنه) لەم بوونەدا.

بـۆ ئـەوەی هێـزو تواناكـانی مـرۆڤ لـە بوارەكـانی هـەڵێنجان و داهێنـان وەك جێنشینێ لەم بوونەدا دەركەوێ، خوای گەورە تەحـەدای فریـشتەی پـێ كـردووە، داكۆكی لەسەر ئەوە كرد كە ئەم (مرۆڤ) بە تواناترینەو شایستەترینە بە میراتگـری زەویو جێنشین بوون تێیدا (وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَـةِ فَقَـالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ * قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْـمَ لَنَـا إِلاَّ مَـا عَلَّمْتَنَـا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ * قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَـالَ أَلَـمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّـي أَعْلَـمُ غَيْـبَ الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَـمُ مَـا تُبْـدُونَ وَمَـا كُنـتُمْ تَكْتُمُـونَ) (البقرة: ٣١- ٣٣). هەروەها ئیمـان ویـستی مرۆڤـی ئـازاد كـرد، چـەند گرەنتیـەكی پێبەخشی كە بۆ هیچ كەس نییە زۆری لێ بكات لەسەر شتێ كە ویستی لێ نەبێ.

كاتێ ستەمكارە خۆ بە خوا كردووەكانی مرۆڤ نوما دەیانەوێ دین وەك پـەردە پۆشو هۆكاری وێرانكردنی ویستی مرۆڤ و زەوت كردنی بـەكار ببـەن، ئـەوە دینـی خوا بە راشكاوانە جاڕ دەداتو بە خوایی بـوونی خـۆی دەفـەرموێت (لاَ إِكْـرَاهَ فِـي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِـنَ الْغَـيِّ) (البقـرة: ٢٥٦). تـازە مـرۆڤ پێگەشـتووەو هەسـت دەكات قۆناغەكانی سەرەتایی تێپەڕاندووەو پێویستی بـەوە نییـە لـە ژێـر فـشاری زۆری شیرو تیرو هۆكاری ترساندنو ئازاردا شتێ وەرگرێ، وەك پێـشتر وابـوو (وَإِذ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّواْ أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُواْ مَـا آتَيْنَـاكُم بِقُـوَّةٍ) (الأعـراف: ١٧١). (وَيَـضَعُ عَـنْهُمْ إِصْـرَهُمْ وَالأَغْـلاَلَ الَّتِـي كَانَـتْ عَلَـيْهِمْ) (الأعـراف: ١٥٧) ئـەو شێوازە نامرۆڤانە بەسای شەرعی خواوە هەڵگیران و نەمان.

بەڵام (ئـازادی رادەربـڕین) و ئاشـكراكردنی، ئیـسلام تـەنها وەك مافـێ بڕیـاری نەداوە، ئەگەر بیەوێ داوای دەكات و ئەگەر نەیـەوێت وازی لێـدێنێ، بـەڵكو وەكـو

ئەرکو واجبو راسپاردەیەك بڕیاری داوە، بەشێك لەو روکنەی کە زۆرینـەی زانایـان بە روکنی شەشەمی ئیسلامی ناوی دەبەن.

ئەو روکنە گرنگو گەورەیـە روکنـی (فـەرمان بـە چـاکەو بـەرگری لـە خراپـە)، هەرکات کـە چـڕەو بـوونو لادان یـان ناپەسـەندییەك یـان هەڵەیـەك لـە کۆمـەڵگادا دەرکەوت هەمووان دەبێت بەشێوازێك لە شـێوازەکانی دەربـڕن نـارەزایی دەربـڕین بەرامبـەری، هـەروەها هـەموویان بەرپرسـێتییەکی هاوبـەش روویـان تێـدەکات بـۆ لابردنـی ئـەو ناپەسـەندەو راسـتکردنەوەی ئـەو کـە چـڕە و بوونـە، لـە بابـەتێکی ئایینیدا بێ، یا کۆمەڵایەتی، کە چڕەویەکەش لە ئاستی لوتکـەو بەرپرسـێکدا بێـت یان کەسێکی سادەی نێو کۆمەڵگا، نارازی بوون لە دەرکەوتنی ناپەسەند لە لایـەن دەسـەڵاتدارو گـەورە بەرپرسـانو بڕیـار بـە دەسـتانەوە هانـدانی زیـاترو هـەڵنانی گەورەتریان پشکە، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: (سید الشهداء یوم القیامة حمزة بن عبدالمطلب ورجـل قـام الی امـام جـائر فمـره ونهـاه وقتلـه)[1]، لـە فەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتووە (أفضل الجهاد کلمة حق عند سـلطان جـائر)[2]، هاندانی ئومەتە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانیان ناڵێم مافیان لە ئازادی راو رادەربـڕین. بێزاندنی ناپەسـەندیش ئەرکـە و دەبێـت ئـەنجام بـدرێ، ئەگـەر لـە سەرەتاشـەوە سەربکێشێ بۆ هێندێ قوربانی دان و شەهیدبوونی هەنـدێ کـەس لەسـەر دەسـتی ستەمکارانو خوێنخۆرانو ئەوانەی دەیانەوێت ببنە کۆسپ لەبەردەم خـەڵکیو رۆڵ بینینیان لە ئەنجامدانی رۆڵی شارسـتانییان بـە راسـتکردنەوەی لادانو کەچـڕەوی نێو کۆمەڵگاکانیان.

---

[1] بڕوانە: مسند أبوحنیفة، ل١٣٣، تحقیق عبدالرحمن حسن محمود. کنز العمال، فەرموودەی ژمارە ٣٣٢٦٤.

[2] ابو داود لە (ملاحم) و ترمزی لە (فتن)دا ریوایەتی ئەکەن.

ئـەم چـەمکانەش لـە نێـو کاربەدەسـتانو تـاك تـاکی موسـڵمانانی سـەردەمی سەدەی یەکەمی ئیسلامیش هەبوون، ئەوەتا کاتێ کابرای قیبتـی میـسر دێتـە لای ئیمامی عومەر و سکاڵا لە دژی عەمری کوڕی عاسو کوڕەکەی بەرز دەکاتـەوە بـۆ ئەمیری ئیمانداران دوای ئەوەی تۆڵەی بۆ سەندنەوەو مـافی خـۆی دایـەوەو رازیـی کرد، ئەو فەرموودەشی فـەرموو: (تاکـەی خـەڵکی دەکـەن بـە بەنـدە و کۆیلـە لـە کاتێکـدا بـە ئـازادی لـە دایـك بـوون)[1]، لـە ئیمـامی عەلیـشەوە گێڕدراوەتـەوە فەرموویەتی: (هۆ خەڵکینە ئادەم نەبە کۆیلەی نـە بـە کـەنیزەیی لـە دایـك بـووە، خەڵکان هەموویان ئازادو سەربەسـتن)[2]، هـەر کـات کـارو ئـەرکێکی گـەورە پـێش بهاتایە ئومەت هەمووی کۆدەکرایەوە تا دەنگی لەسەر بداتو رای خۆیان دەربڕن، تەنانـەت شـوانەکان لـە کێڵگەکانـداو کـچانو ژنـانی ماڵـەوەش رایـان وەردەگـیرا، جارێکیـان کابرایـەك هاتـە لای ئیمـامی عومـەر نـارەزایی دەربـڕی بەرامبـەر هەڵوێـستێکی خەلیفەکـە لای ئـەم روون نـەبوو، زۆر بـە تونـدی لـە رووی خەلیفـە وەستا خەریك بوو ئەوانەی لە خزمەت خەلیفەدا بوون هەستنو بیکەنە دەرەوە، یا بێـدەنگی بکـەن، بـەڵام ئیمـامی عومـەر نـەرێی بـۆ هەڵوێـستەکەیان دەربـڕیو فەرمووی: (لێی گەڕێن، خێر لە ئێوەدا نییە ئەگەر راکانتان دەرنەبڕن (و ئەوەی لە دڵتانایە نەیخەنە سەر زمانتان) خێر لە ئێمەشدا نییە ئەگەر گوێتان بۆ نەگرین).

رەبعی کوڕی عامر کاتێ رۆستەم پرسـیاری هـۆی هاتنیـان دەکـات بـۆ جیهـادو خەبات لە پێناوی خوادا وەڵامی دەداتەوە (خوای گەورە ئێمەی ناردووە تا ئەوەی خواویستی لەسەریەتی بەندایەتی بەندە رزگاری بکەین بۆ بەندایەتی خوای گـەورە وە لـە سـتەمی بەنـدە بـۆ دادگـەری ئیسلام، وە لـە تەنگەبـەری ژیـانی دونیـا بـۆ بـەرفراوانی و گـەورەیی دونیـاو قیامـەت)، رزگـارکردنی مـرۆڤ لـە رووی ویـژدانو هەسـتو ویـستو دەربـڕینو بـزاوتن، پاراسـتنی ئـەم ئازادییانـە - هـەموویان -

---

[1] علي طنطاوي، اخبار عمر وأخبار عبدالله بن عمر، ل ٤٥.

[2] نهج السعادة، بەرگی ١/١٩٨.

پارێزگـاری لێکـردن و پاراسـتنیان کرۆکـی مەبەسـتەکانی ئیـسلامو جیهـادو تێکۆشانەکەیەتی.

ئەگەر خوای گەورە ئیرادەی لەسەر درێژبوونـەوەی جێنـشینایەتی لـەوە زیـاتر هەبوایـە بـواری دامەرزانـدنی چـەندین دامو دەزگـای هەبوایـە ئـەم ئازادییانـەی رێکخستایەو هۆکاری پاراستنیشی بۆ دابین بکردایە، ئـەو دەم ئـەم ئوممەتـەی کـە پێشەنگی ژیانی هەموو ئەم ئوممەتانە بەرەو دوا نەدەگەڕایەوە لەبەرچـاو سـاغیو ژینەوە نەدەبوو بە دواکەوتەو پەراوێز لە دونیای شارستانێتی و پێشکەوتندا.

ئـەو ئوممەتـەی کـە دوای پێـشەنگ بـوونی هـۆگر بـوو بـە لـە دایـك بـوونو دروسـتکردنی سـەرکەشو دیکتـاتۆرو پلۆسـێنەرو داگیرکـەرانی ئازادییـەکانی بەندەکانی خوا، لەو دەمەی پەرچەمی خیلافەت داگیرا، بـەردەوام تـا ئـەمڕۆ زۆرێ لەوانەی بەرهەمهێناوە، گومانی تێدا نییە تەمەنی کورتی خیلافەتو پەلەی هەنـدێ لە بنیادنانی دەسەلاتی پاشـایەتی ـ کـە کۆتـایی نـەهات تـا ئومـەتی دایـە دەست دەسـەلاتدارانێکی سـتەمکارو مـشەخۆر ـ بوویـە هۆکـاری پوکانـەوەی زۆرێـك لـە چـەمکە بنەڕەتییـە ئیـسلامییەکان، لەوانـەش چـەمکی (ئـازادی بـە هـەموو شێوازەکانییەوە) کار بەمەشەوە نەوەستا، لای هەندێ لـە موسـڵمانان کولتـورێکی هزریو رۆشـنبیری دروسـت بـوو کـە ئـەم کەچـرەوییانەی پـشتراستدەکردەوە، یـا هەندێ لەو ئازادییانەی سنوردار دەکرد یـا بنـەبڕی دەکـردن، ئەمـەش کـەلتورێکی هزری دۆڕاوە بۆ کەس نییـە پـشتی پـێ ببەسـتێ، چ جـای ئـەوەی شـانازی پێـوە بکات یا بەرەنگاری لێبکات یا بە گەورەی بزانێ، یا بە ناوی ئیـسلامەوە دوانـی لـە رێگەوە بدات، هەندێ لەم کەلتورانە جێیان بۆ کراوەتەوە لە ژێر ناوی (سد الذرائع) و (الأخذ بالأحتياط والاحوط)، بە داخـەوە زۆرێـك لـە خـەڵك بـە هەڵـە لـەم چـمکە تێگەیشتوون، زۆرێکیش لە دەسەلاتداران دوای فـراوان پێکردنیـان و تێپەڕانـدنیان لە بوارە فیقهییە تایبەتییە سنوردارە دیاریکراوەکەیانەوە هەڵە بە کاریان بردوون، کردونیان بە رێسایەکی هزری کە بوونەتە حـاکمی کـاروانی عەقڵگـەرایی ئوممـەتو

تەنانەت وایان لێکردوون کە دەسەلآتداران مافی سەپاندنی وەسیەتیان بە سەر عەقڵی ئوممەتەوە هەیە، وای کردووە زمانی ئوممەت بێتە دەزگایەکی لالی پرۆگرام بۆ دیاریکراو و راهێنراو لەسەر ستایش و پیاهەڵدان و سوپاسی تاغوتو کلکەکانی ئەویش بکات، نەك هەموو کات، بەڵکو هەر کات پێویست بکات.

ستەمکارانو کاسەلێسانیان لەسەر ئەوە راهاتوون کە خەڵکی هەموو وەکو کەسێکی پێنەگەیشتوو (قاصر) یا منداڵی هەتیوی بێ باوك سەیر بکەن کە چاك و خراپی نەزانێ، لەبەرئەوە ئەم ئوممەتە دەبێ سەرپەرشتیارێکی هەبێت کارەکانی بۆ ئەنجام بداتو چاودێری بکات، بۆیە ستەمکاران خۆبەخشانە (لە رووی میهرەبانیو سۆزیانەوە)! ! هەستاون بە ئەنجامدانی ئەم ئەرکەو سەرپەرشتیاری ئوممەت دەکەن، لە کاتێکدا نیگا کۆرای ئومەتی بە راست زانیوە و بە دوور لە هەڵەی ناوزەد کردووە[1]، ئەگەر هاتو هەڵەش بکات هەرگیز هەڵەی ئەو دیکتاتۆرانە ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا بێنیازبوون لە ئومەتو پشتگوێخستنی ویستی و ئارەزووەکانی و گوێنەگرتن لە رێنموونییەکانیو راوپرس نەکردن پێی یەکێکە لە لە دەروازە گەورەکانی دیکتاتۆریو ستەمکاری (كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى * أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى) (العلق: ٦- ٧).

ئەگەر (ئازادی رادەربڕین) وەك رایەڵێکی رەگداکوتراوی فیکریو پیادەکراو لە ژیانی موسڵماناندا بەردەوام بوایە وەك ئەوەی کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و چوار جێنشینە بەرێزەکەی ئومەت نسکۆی یەك لە دوای یەکی بەسەردا نەدەهات، ئومەت نەدەکەوتە ئەم داوە تەنراوە، زۆرێك لە هەوڵەکانی چاکسازی لە نێو ئومەتدا لەبار بران‌و دەستیش گیرا بەسەر شوێنکارەکانیاندا، کە ئەوانەش

[1] ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیە (لا تجتمع أمتي على الضلالة أو على الخطأ) ئەم فەرموودەیە بە گشت سەنەدو بێژە جیاوازەکانیەوە لە پەراوێزی کتێبی (المحصول من علم أصول الفقه)دا تەخریج کراوە، بڕوانە بەرگی ٤ ل ٧٩ـ ٨٩.

توانییان گەلەك نەخۆشی لە نێو بەرن لەوانە قـەیرانی فیکـری‌و ونبـونی کـەلتوری، زۆرداری سیاسی، قەیرانی هۆشیاری‌و بێداری خودی، بـەڵام بابـەتی (ونبـوونی رای پێگەیشتووی تەندروست‌و بەربەست دروست کـردن لەبـەردەم بڵاوبوونەوەیـەدا بـە هەموو هۆکارێك) لە نێوان گـرنگترین بۆشـایی‌و هۆکـاری هەڵـەکردن‌و بـەرەو دواوە گەڕانەوە ـ لە هەڵوێستەیەکی زۆر جیاوازدا بێبەش بوون لە رای پێگەیشتوو ـ چۆن رای پێگەیـشتوو لـە نێـو ئومەتێکـدا لـە دایـك دەبێـت لەکاتێکـدا ئومـەت هـەموو تواناکانی خستۆتە گەڕ بۆ گـەمارۆدانی عـەقڵ و کـەم نیـشاندانی، تـەنگ هەڵـچنین بەزەین، گاڵتەکردن بە فیکر، لە خزمەتـدا دانـان‌و بـەدیهێنانی هۆکـاری دوکـەوتن‌و چـاولێگەری، ئەمــەش کـورت نــەهاتووە لــە نێـو رێکخـراوە پاشـکۆکاندا، بـەڵکو تەشەنەی کردووە بۆ گروپ و تاقم‌و دەستەو پارت‌و رێکخراوو بزاڤانەی کە بونەتـە یارمەتیـــدەری ئومـــەت بـــۆ بێـــداری‌و تێپەڕانـــدنی قەیرانـــەکانیان‌و لانکـــەی پــەروەردەکردنی رەگـەزی چـاکی نێـو نەوەکانیانـەوە، وایـان لێهـاتووە لـە ژێـر دروشمی (جێبەجێ بکەو پاشان قسەی لەسەر دەکەین) ئیشەکانیان رادەپـەڕێنن، تەنانەت رێکخراوو بزاڤە ئیسلامییەکانیش وایان لێهاتووە لەسەر ئازادی رادەربـڕین کۆت‌و زنجیریان داناوەو دەنگی بەرامبـەریان زەوت کـردووە، تەنانـەت جـاری واش دەبــێ دەگاتــە دەرکــردن لــە ریزەکــانی رێکخراوەکانــدا، هــەروەها نەهێــشتنی بڵاوبوونەوەی نووسـینەکانی لـە نێـوان گرووپـی پیادەکـەری هـەق‌و تـیرەو تـاقمی سـەرکەوتوو، بەبیانووگـەلێکی جۆراوجـۆرەوە، وەك گوێڕایـەڵی ئـەمیری بەیعـەت پێکراو، یا بۆ ئەوەی ئەمیری رێکخـراو بێتاقـەت نـەبێ، ئەوانـە هەرچـی کەلـەپوری فقهیمان هەبوو کە زادەی چەرخ‌و دەسـەڵاتی پاشـایی بـو خـستە بـەردەم ئـەمیری بـزاڤ و رێکخـراو تـا کۆمەڵـە هۆکـارێکی شـەرعی و ئـامرازی کەلـەپوری دەسـەڵاتی داپلۆسێنەری پێ بێ لە پێناو مرانـدنی راوێـژدا، تـا رای بەرامبـەر لـە دایـك نـەبێ، بەمەش ئەمیری کۆمەڵ یا سەرۆکی رێکخراوو بە لێهـاتوویی و لێوەشـاییەوە ببێتـە میراتگری ستەمکاران لە ناوەندەکاندا، بەڵام ئەمجارە لە ژێر دروشمی (حاکمیـەتی

خـوای گـەورە)دا، ئەمـەش بـەوەوە نەوەسـتا سـەری کێـشایە نـاو بنەماڵـەو خانەوادەکانمان، باوك گەورەی گوێڕایەڵ کراوە تـەنها قـسە قـسەی ئـەوە، کـەس بۆی نییە وشەیەك لەدەمی دەرچێ، وێڕای ئەوەی کە ڕۆڵی باوکی موسڵمان ئـەمڕۆ تەنها وەك بەڕێوەبەری خۆراك یان ئوتێلێ زیاتر نییە، زۆر دەگمەنە بـوار بـدات بـە خێزان و منداڵی رای خۆیان دەربڕن، بەم شێوازە دیکتـاتۆری‌و رای بەرامبـەر پێـی نایە ناو ژیان، تەنانەت لە رەگو ریشەشیان دەرهێنا، تا وای لێ هات ئەم راستییە لە نێو کۆمەڵگادا ون بوون و لە نێو ئومەتـدا ئـەم واقیعـە هاتـە گـۆڕێ (عەقڵیـەتی دواکەتوو، سروشتی رانەمەڕ، نەفسیەتی کۆیلە).

چۆن دیکتاتۆری‌و تاك رایی ئەم ئومەتەی گەیاندە ئەم بارودۆخە؟!

ئەمە ئەو ئومەتەیە کە زانایان پێشینی لە زانـستی (أصـول الفقـە)دا (رایـان)[1] بەیەکێ لە بەڵگە شەرعییەکان ئەژمار کردووە.

هـەرکات بـەرادەربڕین لـە رێـی هۆکـاری بڕواپێکـراوی شـەرعییەوە گەشـتنە ئەنجامێك، ئەبێتە یاسـایەکی شـەرعی‌و خـەڵکی دەبێـت گوێڕایـەڵی بـن، بـەڵام لای دواکـەوتووەکان رادەبـڕین بۆتـە بیدعـەتو تـاوان‌و کەچـڕەوی‌و پەرتـەوازەبوون‌و دەرچوون لە سوننەت، وە دوورکەوتنەوە لە شوێنکەوتن کە هەندێ بانگەشەی بـۆ دەکەن لە پێناو پاکژکردنەوەی کەش‌و هەوای ئومەتو پاراستنی لە دەرچوون، وە ئەمەشـیان بـە گـومڕایی ناسـاندووە کـە دەبێـت خـەڵکی لـێ بێـدار بکرێتـەوە وە دەروازەیەك کە دەبێت داخرێت نەبادا روخساری ناشیرین‌و خراپ بێتە ناو و دواتـر نەتوانرێ داخرێ، لەبەرئەوە بیرکردنەوە راگیراوە، رادەرنـەبڕین و بێـدەنگی کرایـە گەرەنتییەکی بەهێز لە پێناو مانەوەی هەندێ ئەفکاری وەستاوی مت بـووی بـاوی نـاو ئومـەت کـە زاڵ بـوون بەسـەر عەقڵیـدا، هـەرکاتیش پێویـست بکـات دووبـارە وەبەردەهێرێنەوە.

---

[1] دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ هەر کتێبێکی کورت یا درێژ لەم بوارەدا.

بەراست چ دەروازەیەکی شەڕو خراپە هەیە نەکرابێتەوە لە رووی ئومەتدا؟ خراپەو شەڕ بە هەموو شێوازەکانییەوە ـ پەنا بە خوا ـ بە لێهاتووییەوە لە هەموو لایەنەکانی ژیانی ئەم ئومەتەوە خرۆشاوەتە ناوی، لە دەروازەی جۆاوجۆرەوە کە دەربڕین و ئازادی رادەربڕین هیچکام لەوانە نییە، کاتێ تۆ ئەم دەروازەیە دادەخەی لە دەروازەی ترەوە داگیرکراوی دێ، کێ بەرپرسە لەم هەموو نەهامەتییانە؟! زۆر بە کورتی دیکتاتۆری دەسەڵاتدارو ستەمکارانو دەستەپاچەیی زانایان و نەزانی نەوەکان، نەك رادەربڕینو ئازادی رادەربڕین.

دیکتاتۆری ستەمکاران شوێنکارو کاریگەری خراپیان ناسراوەوە دەقەکانی قورئانو فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ وریایی داوە لەوبارەیەوە، هەر سورەتێکی قورئان دەخوێنیەوە بە توندی وریات دەکاتەوە لە دیکتاتۆریو یاخی بوونو شوێنکارو ئاسەواری خراپیان لەسەر رماندنو وێرانکردنی ژیارەکانو داگەڕاندنو بادانەوەی نەتەوەکانو هەرماندنو کاولکردن بوون.

سوننەی پێغەمبەر ﷺ پڕە لە وریای دان لە دیکتاتۆری و سەرکەشیو واجب بوونی دژوەستانو بەرەنگاری کردن، بەکاربردنی هەموو هۆکارێکی گونجاوو وزەو تواناکان لە پێناو نەهێشتنی و بنەبڕکردنی هۆکارەکانی دروست بوونی، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ چاولێکراوو نموونەیە لە فێرکردنی هاوەڵاندا بۆ پێکهێنانی رای تەندروستو دەربڕینی بەهەموو هۆکارێك، ئەوەی لێوەی گێڕدراوەتەوە لە پرسو راوێژو گەڕانەوە بۆ پوچوونەکانیان و پەیڤین لەگەڵ هاوەڵانیداو هاندانیان لەسەر کۆشین بە ئامادەبوونی خۆی یا ئامادەنەبوونی هەموان بەڵگەی لەسەر ئەو راستیە.

وێڕای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ خاوەنی بەهێزترین عەقڵە کە مرۆڤ هەیەتی لەسەر رووی زەویدا و پاکترین زمانو روونترین تێڕوانین، لەگەڵ ئەمانەدا هەمووی لە گەورترین و بچوکترین شتدا راوێژی دەکردو هەنگاوی بەسەردا نەدەنا، لە کاتێکدا ئەو لە هەڵە دوورە و ئەوەی دەیکا نیگایەو لە لایەن خواوەیە، راوێژی بە

هاوەڵان دەکردو رای لێوەردەگرتن‌و بەڵێنی پاداشتی گەورەشی پێدەدان، پێی دەفەرموون (ئێوە خۆتان شارەزاترینن لە کاورباری دونیاییتان)، زۆرجاریش ئیشی بەراوێژە کەی ئەمان دەکرد، نیگای بۆ هاتووی لەسەر رایان لە داوکەوتە (واقعدا) پیادە دەکرد، ئەگەر بێتو کەس هەبێ بێ نیاز بێت لە پرس‌و راوێژ، یا مافی ئەوەی هەبێ گوێی پێنەداو ئیشی پێنەکات یا تەنها بۆ ریکلام‌و وەرگرتنی قسان بێ ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەمین کەسە، چونکە خوای گەورە پاکی کردۆتەوەو لە هەر هەڵەیەك پاراستویەتی کە ببێتە هۆی تاکڕەوی و دیکتاتۆری، بەڵام خوای گەورە تەئکیدی لەسەر کردووەو فەرمانی پێکردووە بە تەئکید فەرمانی خواش بۆ واجب بوونە، خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺ پاراستووە لە هەنگاونان بەسەر راوێژو پشتگوێخستنی...

کاتێ دەرئەنجامەکانی راوێژ پێچەوانەو خراپ شکانەوە بوون، لە کاتی دەرچوون لە مەدینە بۆ غەزای ئوحود، موسڵمانان خولی دوهەمی شەڕەکەیان بەسەردا شکایەوەو شکان، ترس لەوە هەبوو کە راوێژ کەم سەیر بکرێ‌و یا گوێی پێنەدرێ، قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوەو پێداگری لەسەر کرد بە فەرمانێکی بێ ئەگەر و فەرمووی: (وَشَـاوِرْهُمْ فِـي الأَمْـرِ فَـإِذَا عَزَمْـتَ (دوای راوێژپێکردن و را وەرگرتن گەشتیتە دەرئەنجامێکی روون‌و ئاشکرا) فَتَوَكَّـلْ عَلَـى اللّـهِ) (آل عمـران: ١٥٩).

لێبڕان لەسەر ئیشکردن دوای راوێژو دەرئەنجامی راوێژە، راوێژ پێشەکی‌و هۆوبۆنەی لێبڕانە لەسەر ئیشکردن ئەمەش بواری ئەوە نادا کە بوترێ راوێژ (معلمة[1] وليست علامة) لە کاتێکدا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ کرابێ پابەند بێت پێوەی کەسانی تر لە پێشترن بۆ پابەندبوون پێی، ئازادی رادەربڕین بنەمایەکی راوێژی لەسەر بنیادنراوە، وە پێویستییەکی تەواوکاریەتی، راوێژیش بەبێ را

[1] پرسە گورگانە.

دەربڕین نابێت، ئەمەش وەك ئەو ڕێسایە وایە کە ئوسوڵیان فەرموویانە: (ئەوی واجبی ڕەهای پێتەواو نەبێتو لە توانادا هەبێت ئەویش واجبە).

لەگەڵ ئەوەشدا دیکتاتۆرەکان مافەکانیان زەوت کردووە وەچەو نەوەکانیان بە قوڵایی مێژوودا درێژبوونەتەوە لە زۆربەی قۆناغەکانی مێژوودا، دینو ژینی لە خەڵکی تێکداوە، هاوکاری ئەم ستەمەشیان کۆمەڵە زانایەکی خوژێن بوون کە زانستەکەیان ترسی خوای لە دڵدا دروست نەکردنو ستەمەکەیانیانی پەردەپۆش کرد، گەردنی دەقە پیرۆزەکانی قورئانو سوننەتی پێغەمبەریان ﷺ هێندە نەوی کرد تا بواری ستەمو نادادگەری بۆ دەسەڵاتدارانی زۆردارو ستەمکار کردەوە، هەیان بوو فەتوای دەدا شوراو راوێژ تەنها بۆ بەرچاو روونییە نەك گوێکردنو ئیش پێکردن، هەشیان بوو فەتوای بەوە دەدا کە راوێژ تەنها بە دوو کەس دەکرێ بە بەڵگەی راوێژ کردنی پێغەمبەر ﷺ بە ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عومەر، هەشیان بوو دەیوت تەنها سێ کەس بۆ پرسو را بەسە، چونکە کەمترین کۆ سێیە، هەشیان بوو دەیگوت چوار کەس، هەشیان بوو دەیوت دوازدە کەس دواسنوورە، پێشەوا بۆ خۆشی سەرپشکە لە هەڵبژاردنی ئەو دوازدە کەسە بە بەڵگەی (اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيباً) (المائدة: ٦) لای ئەوانەی کە پێیان وایە (شەرعی پێش ئێمە شەرعە بۆ ئێمەش) بەپێی ئەم ڕێسایە پێیان وایە راو پرسو کۆڕی راوێژو پەرلەمان نابێت ژمارەیان لە ژمارەی پەیماندەرانی عەقەبەی بچووك زیاتر بێت... لەگەڵ چەندین راوبۆچوونی تر کە هیچکام بەڵگەیان لەسەر نییە.

لە سۆنگەی (داخستنی هۆکارەکانی فیتنەو ئاژاوە) یا (هۆکارەکانی دەستە دەستە بوون و پەرتەوازەیی) شەرعیەت بەخشراوە بە پێشەوای زاڵو سەرکەوتوو، بەمەش پێشەوایەتی زۆردارو ستەمکار شەرعیەتی پێبەخشرا، حوکمو دەسەڵاتەکانیشیان هەر لە چرۆ کردنیاندا پیادە کراو، ئەمەش بویە هۆی رازی بوونی ئومەت بە شۆڕشو هەڵگەڕانەوە سەربازییەکان و گەردن کەچ بوونی بۆ رەگەزە زاڵەکان بە درێژایی تەمەنی.

کەسیش نەبوو نارەزایی بەرامبەر بەم بارودۆخە دەربڕێ تەنها چەند کەسێکی کەم نەبێ لە زانایانی چاكو بۆ خوا بوو، ئەویش سەدایەکی کپ کراوو بێدەنگیان هەبوو، دەگمەن بوو گوێی بۆ بگیرێ وە لە ژێر شێرو دەسەلاتی (بنبڕکردنی هۆکارەکانی ئاژاوە)و (دەستگرتن بە خۆپارێزی)ەوە ئەم ئومەتەمان هەمیشە لە ژێر بارودۆخی نامۆو مۆلەقدا ژیاوە، ڕێساکانی رژێمی لە دوای ئەو شۆڕشەی کرا بەسەر خەلافەتی راسدیندا لە کارخران، دەسەلاتدارانی لادەرو ستەمکارو زۆردارو زاڵ لە ئیسلامدا تەنها رژێمی دادوەرییان هێشتەوە تا ببێتە گرەنتیەکی بەهێز (لە زۆر کاتدا) بۆ پاراستنی شتە سەرەکییەکانی ئەم ئومەتە لەو لایەنەیدا کە زیانی بۆ دەسەلاتدار نییە.

ئەم بوارەش پارێزراو نەبوو لە دەست تێوەردانی دەسەلات بۆ خراپ بەکاربردنو تێکدانی، ئەگەر شەونخونی زانایانی بۆ خوا بوو نەبوایە کە هەمیشە پارێزەری بوونو شەونخونییان کێشاوە لە پێناو هێشتنەوەیدا، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ لە ستەمکاران لە کاتی تواناو دەسەلاتدا دادوەرییان کردۆتە یەکێ لە چەکوشەکانی دەستیان بۆ داپلۆساندنی ئۆپۆزسیۆن لە ژێر ناوی پاشگەزبوونەوەو لادانداا، وە زۆرێك لە ئۆپۆزسیۆنیان تاوانبار کردووە بە دژی ئاینو دەرچوو لە ئاین بۆ دابڕینی ئومەت لە ئۆپۆزسیۆنو نەهێشتنی پلەو پایەیان لەناو خەڵکیدا، وێڕای ئەوەی هەندێ لە زانایان بێدەنگی خۆیان لەم بارودۆخانەدا بەرامبەر ستەم و زۆرداری دەسەلاتداران بە بیانووی (پارێزگاری لە یەکریزی ئومەتو پاراستنی یەکبوونی) لەملاوە ستەمو زۆری دەسەلات کە کۆنو نوێ پیشەیان بووە توانای ئومەتیان لەکارخستو ئومەتیان پارچە پارچە کرد، هەر گروپەو کرانە دارو دەستەی ستەمکارێك کە بەرامبەرکەیی پێ لەناو دەبردو لەناوی دەدا، بەم شێوەیە ستەمی ستەمکاران و بێبەشکردنی ئومەت لە مافی رەوای رادەربڕین و بیرکردنەوەو قسەی خۆ کردن بویە هۆی دارمانی بنەماکانی تری ئومەتو بنەبڕکردنی شتە چاکەکانی.

بەرپرسی سێهەمیش بێئاگایی نەوەکانی ئومەت بوو، بەمانـە یاخۆگێـل کردنـی زۆرێکیان بوو، یا رازیبوون بۆ خۆنەزان لە قەڵەمدان بۆ ئاسانکاری ملکەچ بوون بـۆ سـتەمکاران و خۆدانـە پـەنای دەسـەڵاتداران لـە لایـەن هـەڵگرانی زانـستو فکـرو خامـەوە، ئەمـەش بۆیـە سێکۆچـکەی نـەزانیو نـاپیرۆزەیی (سـتەمی سـتەمکارو دەستەوسانی زانایانو نەزانی ئومەت).

فیرعەونی سنوربەزێن کاتێك بـە گەلەکـەی وت: (أنـا ربکـم الأعلـی) (النازعـات: ٢٤)، ئەم وتەیەی کاتێك بەکارهێنا کە بینی جـەماوەرێکی بێئاگـا و گـەردن کـەچو گوێڕایەڵی هەیە، یەکێ لەو شتە بنچینیانەی دەسەڵاتداری ستەمکار فریو دەدا، بێ ئاگایی جەماوەرو گەردن کەچـی و گوێڕایەڵییانـە، دەسـەڵاتدار تـەنها تاکێکـە وەك هـەموو تاکـەکان، لـە راسـتیدا نـە هێـزی هەیـە نـە دەسـەڵات، بـەڵکو ئـەوە جەماوەرەکەی بێئاگاو دەستەمۆیە، پشتی بۆ رادەخـات تـا سـواری بـێ، گـەردنی شل دەکات تا رێنوی ملی بکاتو رایکێشێ، سەری نەوی دەکـا بـۆ ئـەوەی سـەری ئەو بەرزو دیار بێت، واز لە مـافی سـەربەرزی خـۆی دەهێنـێ ئـیتر ئـەویش ملـهۆڕ دەبێ.

جـەماوەر ئـەم هەڵوێـستەی دوو لایەنـە، یـەك فریـو دراوو فریـو خـواردووە لایەنەکـەی تـریش دەترسـێو ترسـێنراوە، ئـەم ترسـەش تـەنها داڵغـەو خەیاڵـە، ستەمکار تەنها تاکێکە ناتوانێ ئازاترو بەهێزتر بێت لـە هـەزارەها، بگـرە ملیۆنـەها کەس، ئەگەر ئەو تاکانە هەسـت بـە ئینـسانیەت و رێـزو سـەربەرزیو سەربەسـتی خۆیان بکەن.

هەر تاکێـك لـەم ئومەتـە لـە روانگـەی هێـزەوە هاوشـانی دەسـەڵاتدارە، بـەڵام دەسەڵاتدارەکە فریوی دەداو دەیخەڵەتێنێ بەوەی کە ئەم ـ دەسەڵاتدار ـ شـتێکی هەیە دەتوانێ زیانی پێ بگەیەنێ یا سودی پێ ببەخشێ.

دەسەڵاتداری ملهوڕ گەلەکەی سوك سەیر دەکاتو لە رێـی ترسـاندنو چـاو لـێ زیتکردنەوە دەیانترسێنێ، ئەوانیش لەبەر لە سنوور دەرچوونو دەروون بەزیویاندا

گوێڕایەڵ دەبن، دەسەڵاتدارانی ستەمکار یەکەم جار جەماوەر دوور دەخەنـەوە لـە هەموو ریبازەکانی مەعریفـەت، راسـتیەکانیان لێدەشـارنەوە تـا لـە بیریـان بکـەن، جارێکی تر نەچن بە دوایاندا بگەڕێن، دواتر ئەوەی بیانەوێ بیخەنە مێشکیانەوە تا دەرونو مێـشکیان مـۆرکی ئـەو شـتانە وەرگـرێ کـە ئـەمان دروسـتیان کـردوونو ئاخنیویانەتە مێشکیانەوە، ئەوجا رێخۆش دەبێـت بـۆ دەسـەڵاتداری یـاخی گەمـە کردن بە جەماوەرو بە دوو خۆیانیـان دەخـەن، ئـەو دەمـەش رێـو شـوێنی گرتنـی جەماوەر بە هۆی رامبونیانەوە ئاسان دەبێتو بە ویستی خۆیـان چـەپو راسـتیان پێدەکەن بە هۆی زاڵ بـوونی دەسـەڵاتە دیکتاتۆرەکـانیش بەسـەر جـەماوەردا لـە سـنوور دەرچـوونی جەماوەرەکەیـەوە و نـەگرتنی رێبـازی راسـتە، دەسـتیان بـە رێسمانی خواوە نەگرتووە بە تەرازووی ئیمان شتەکان ناکێشن، پەناش نابەنە بـەر قورئانو بەڵگەو سەلماندنەکان.

بڕواداری لە خواترس، ئەستەمە یاری پێ بکرێتو فریـو بـدرێتو وەکـو پوشـی بەر بای لێ بێت، لەم روانگەیەوە خوای گەورە باس لـە هۆکـاری گـەردن کەچـی و ملکەچی گەلەکەی فیرعـەونی دەکـات بـۆ فیرعـەون دەفـەرموێ: (فَاسْـتَخَفَّ قَوْمَـهُ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْماً فَاسِقِينَ) (الزخرف: ٥٤)[1].

ئەگـەر هـاتوو زانـاو بیریـارو نووسـەرو کاراکـانی بـواری پـەروەردە ئەرکـەکانی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن، بەرەنگاری فیـسق ببنـەوەو تـەقواو خواترسـی لـە نێو خەڵکیدا بڵاو بکەنەوە، ئایا ئەو دیکتاتۆرانە دەتوانن گاڵتە بەو خەڵکـە بکـەنو عەقڵیان بشۆنەوە و لە دووی خۆیانیان بنێن؟ نەخێر هەزار جار نەخێر.

ئەگەر بێتو زانایـانی ئومـەت (مەبەسـت تـەنها (زانایـانی ئـایینی) نییـە، بـەڵکو هەموو ئەوانەی زانستێکیان هەیەو پسپۆڕن لە بوارێکدا، بەڵام زانایانی ئاینی دەبێ پێشەنگ بن) هەستن بە ئەنجامدانی ئەرکەکانیان و رووبەڕووی هەموو شێوازەکانی فیـسق وەسـتانەوە، لـە بۆچـوون، فیکـر، بـیروڕا، ئاکـارو رەوشـت، مامەڵـەکردن،

---

[1] بڕوانە تەفسیری سورەتی (زخرف): في ظلال القرآن ـ سيد قطب.

کردارو ئیش، ئەوە روودەدات؟ ئایا خەڵك فاسق دەبنو دیکتاتۆرەکانیش دەتـوانن ملیان با بدەن؟ نەخێر.

ئەگەر زانایان خەڵکی تێبگەیەنن کە ئەو دیکتاتۆرە خۆی بـە خـوا دەکـاتو بـە زمانی حاڵ و قسەو هەڵسوکەوت و ئایندەی دەیەوێ خەڵکی بیکاتە هـاوەڵی خـوا، بێدەنگ بوون بەرامبـەر دیکتـاتۆر یـا رازی بـوون بـە دیکتـاتۆرێ یـا لەکارخـستنی پرسو راوێژ، هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردنە.

خوای گەورە هەرگیز رازی نابێ لـە دیکتـاتۆرێ یـا لـە کەسـێ بەویـستی خـۆی دیکتاتۆری بکاتو تەنها خۆی چاوساغ بێت، با نوێژ بکاتو رۆژووش بگرێتو خۆی بە موسڵمان بزانـێ، ئەگـەر وا بکـەن ئایـا ئومـەت لـە دیکتـاتۆر بێـدەنگ دەبـن یـا دیکتاتۆرێ هەرگیز دەتوانێ گاڵتە بە ژێری ئومەت بکـات و دیکتاتۆرانـە هەڵوێـست بنوێنێ؟

خۆزگـە زانایـانی ئومـەتو بیریـارو نووسـەرو وتاربێـژانی و بانگبـەرانی سـوور دەبوون لەسەر ئەوەی خـەڵکی ئاشـنا بکـەن بـە ئـەركو مافـەکانیانو رێبازەکـانی خێرو شەڕ، وەك چـۆن فێـری پاکـژیو چـۆنیەتی نوێـژو مـەکروهـ بـوونی نـاوبردنی پێغەمبـەر ﷺ بـە (سـید) و هەسـتانەوە لـەکاتی ناوبردنیـدا.... هتـد ئـەو دەم بارودۆخ و حاڵی ئومەت دەگۆڕێ و هۆشیاری زیاتر دەبوو.

خۆزگە فێریان دەکردن گەورە سەیرکردنی ئـەو کەسـەی رێـز لـە دروشمـەکانی خوای گەورە ناکرێ، چەپڵە بۆ لێـدان و پـشتگیری کـردنو خزمـەتکردنی سـتەمە، ستەمیش تاریکیو گومڕاییە بـۆ قیامـەت، دەرچـوونە لـە تـەقوا، ئـەوەش تـەقوای نەبوو لە سنوورو دەرچوونە، وە هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردنە، هاوەڵ پەیدا کردنیش گـەورەترین سـتەمە، خۆزگـە فێریـان دەکـردن دەسـەڵاتدارانیان خزمـەتکارو جێبـەجێکارن، ئەگـەر گەنـدەڵ بـوون لـە خزمەتکردنـدا لەسـەر ئومـەت واجبـە بیانگۆڕێ.

خۆزگـه دەیـانزانی دەسـەڵات ئەركـە نـەك ڕێـز، سیاسـەتیش ڕەچـاو كـردن‌و بەڕێوەبردنی كاروباری ئومەت‌و خزمەتكردنیـەتی، ئەنجامـدانی فـەرمان بـە چـاكەو ڕێگری لە خراپە فەرزێكی عەینەو بەرپرسیارێتییەكی گشتییە، بۆ كەس نییـە وازی لێ بێنێ، یا مافی ئەوەی هەبێ لێی گەڕێ، وە لەناو بردنـی سـەرمایەی نەتـەوەیی تاوانە، وە هاندانی دوژمنان بـۆ كـەڵك وەرگـرتن یـا بەشـداریكردنیان لـە خـواردنی سەرمایەی ئومەت تاوانە، دەسـت بەرسـەراگرتنی هەركەسـدا بـەبێ تـاوان تاوانـە، زەوت كردنـی مـافی ڕادەبڕینـی هـەر تاكێـك لـە هـەر كاروبـارێكی پەیوەندیـدار بـە خۆیەوە تاوانە، دەستدرێژی هەر دەزگایەكی دەوڵەت لە سەر ئـازادی یـا كەسـێتی هەر هاووڵاتییەك تاوانە.

ئەگەر هاتبا لـەناو ئومەتـدا كەسـانێكی بـە ویـژدان هـەبن، گونـاهو تـاوانێ كـە خەڵكی ئەنجامیان دەدات بە دەسـەڵاتدارو بێدەسـەڵاتییەوە بەرامبـەر بـە یـەك وە گوناهی گەورەو بچوكیان بۆ دەست نیشان بكەن، بۆ نموونـە وتـراوە دیكتـاتۆری‌و حوكمی تاكەڕەوی لە گوناهە گەورەكانە، ڕاوێژ نەكردنی لەگەڵ ئومەتدا لە گوناهـە گەورەكانە، پاڵپشتی كردنی لـەوەی دیكتـاتۆرێ دەیكـات لـە گوناهـە گەورەكانـە، بێدەنگ بوونیش لەسەر تاوانەكانی لە گوناهە گەورەكانە، بێبەشكردنی هەر تاكێك لە ڕادەربڕینی گوناهێكی گەورەیە، چاودێری كردنی خـەڵكی‌و سـیخوڕی كـردن بـە سەریانەوەو ڕاوەدوونانیان، ئەوانە هەموو لە گوناهە گەورەكانن، كە خوای گەورە لێپێـچینەوەیان لەسـەر دەكـات، بەشـداری كـردن لـەم گوناهـە گەورانـە و هانـدان لەسەری‌و بێدەنگ بوونیش بەرامبەری هەموو ئەمانە لە گوناهـە گـەورەكان ئـەژمار دەكرێن.

بەخشینی سـەروەت‌و سـامانی ئومـەت وەك موچـەو دیـاری و پـاداش بەوانـەی سیخوڕی دەكەن بەسەر خەڵكەوەو هەواڵ دێنن بۆیان بە فیڕۆدان‌و سـوتاندنی ئـەو سەرمایەیە، ئەو خەڵات‌و بەخششانەی كە دارو دەستەی ستەمكاران داوای دەكـەن بەرامبەر یارمەتی دان‌و هاریكاری ستەمكردنەكەی حەرامەو هیچ جیاوازییەكی نییـە

لەگەڵ دزیو دەست درێژكردنو سودو پارەو كرێی لەشفرۆشیٚ، وێرای ئەو گوناهە گەورانەش كە خەڵكی ئەنجامیان دەدەن و وەبەر یان دەهێنن بەبیٚ ئاگایی، ئەگەربێتو (كەسانی رەخنەگر هەبن) ستەمكاران هەندیٚ دەستیان كورت دەبێتەوەو دارو دەستەكانیشیان هەندیٚ سڵ دەكەنەوە و ستەم ناكەن، لەگەڵ ئەمەشدا خەڵكان سڵ دەكەنەوە لەوەی ببنە داردەستی ئەو ستەمكارانە.

بەروانین بۆ واقعی ئیسلامی هاوچەرخ ئەوە بەدی دەكەین، ونبونی (ئازادی رادەربڕین) هۆكاری زۆرێك لەو دواكەوتنانەیە لە زۆربەی وڵاتاندا، ئەوەش (عبدالرحمن الكواكبی) نووسیویەتی لە كتێبەكەیدا ساڵی ١٩٠١ (سروشتی دیكتاتۆریو شوێنكاری كۆیلایەتی) بێنیازمان دەكات لە زانینی زۆرێك لە شوێنكارەكانی دیكتاتۆری لەسەر هەموو لایەنەكانی ژیانی كۆمەڵگاو چۆن جموجۆڵ دەكات وەستانو تواناش دەستەپاچەیی. دیكتاتۆری كەسێكی پێشكەوتوو شارستانی وەبەرناهێنیٚ، بەڵكو ئامێرێك دەبێت كە لە گەمیەی (فلك) رێبازێكی سیاسیدا دەخولێتەوە، كار دەكات لە پێناو پاراستنو مانەوەی ئۆرگانێكی و بیۆلۆژی مرۆڤ، لێرەوە هەوڵدان لە پێناو بنیادنانەوەو بەرەو شارستانی بوون سەرەتا پێویستی بە توێژینەوەیە لەسەر ترسناكترین هۆكار یا دژە هۆكاری كرداری ژیاری و چارەسەركردنی، پێدەچێت (ئازادی رادەربڕین) مەرجێكی بابەتی پێویستی بێت بۆ چارەسەركردنی هەموو ئەو كێشانەی تر، هیچ ئاسەوارو كاریگەرییەك بەبیٚ ئازادی رادەربڕین و تێڕوانین و بیركردنەوەو كاراكردنی نابێت لەسەر هەر كێشەو بگرە و بەردەیەك، ئەویش دوای لادانی هەرپەردەیەك لەسەر ئەقڵی مرۆڤی موسڵمان و هەڵگرتنی كۆتو بەندی دەسەڵاتی سیاسیو پارتو كۆمەڵگاو پێشەواو موفتیو رۆشنبیر.... هتد لەسەر هزری. كردنەوەی ئاسۆ فیكریە فراوانەكان و ئاوەڵابوونیان لەبەردەمیدا بەبیٚ كۆتو بەند، بەهێزكردنی چمكی سەروەری، رێز، رزگاربوونو ئازادبوون، راوێژ، دادگەری لە دەروونیدا، بۆ ئەوەی تەنها ئەو شتە وەرگریٚ كە بەڵگەی زانستی لەسەرەو بڕوای

پێیــەتی، ئــەو دەم تــاك نابێتــە ئــامێری دەســتی ڕژێمێــك و پارتێــكو كۆمــەڵو ئاینڕایەك، بەڵكو تەنها بۆ هەق گەردن كـەچ دەبـێ، كـە ئەمـەش مەبەسـتی خـوای گەورەیە لە بەدیهێنانی بوونەوەردا.

ئەو توێژینەوەیە ئـەوڕۆ پێشكەشی دەكـەین وەك پێشەكییەكی پێویسـتە بـۆ كردنـەوەی دەروازەی پـەیڤینو توێژینـەوە لەمـەڕ ئـەم بابەتـەوە (بابـەتی ئـازادی ڕادەربڕین) لە لایەن توێژەرو لێكۆڵەرو بیریار و زانایانی ئومەتەوە، نووسـەری ئـەم كتێبە پێشتر پێداگری لەسەر ئەم بابەتە كردووە لە كتێبی (هزرو ئاكار)، هـەروەها (د. عماد الدين خليـل) تێڕوانینێكـی هاوشـێوەی خـستۆتە بـەرباسو لێكۆڵینـەوە، بەڵام جیاوازە لە كتێبی (لەمەڕ داڕشتنەوەی هزری موسڵمانان)دا، پەیمانگا هەست بە چاپكردنەوەی دوای پاڵفتەكردنیو زیـادكردنی بـیری نـوێ لەلایـەن نووسـەرەوە بۆی، هەروەها ئـەم توێژینەوەیـە كورتـە كـە تایبەتـە بـۆ باسـكردن لەسـەر ڕۆڵـی ئازادی ڕادەربڕین لەسەر یەكبوونی فیكـری نێـوان موسـڵمانان، دەبێتـە كلیلـێ بـۆ چـەندین توێژینـەوە لەسـەر ئـەم بابەتـە تـا ببێتـە بابـەتێك تـاكی موسـڵمانو بـە تەنگییـەوە بـێ و هـەوڵی بەدەسـتهێنانی بـدات، ئەمـەش دەبێـت مـەرامی هـەر موسڵمانێ بێت لەم ژیانەدا، ڕۆڵی ئێمە ئازادكردنی مرۆڤە وەك مـرۆڤو ڕزگـاركردنی لـە بەندایـەتی بەنـدە بـۆ بەندایـەتی خـوای تـەنها، وە لـە سـتەمی ئـاینو ئـاینراو ڕژێمەكان بە هەموو شكڵو شێوازیانەوە بـۆ دادگـەری ئیـسلام كـە مانـای ترۆپكـی ڕزگاریو ڕەهاییە لە هـەر بەنـدو كـۆتێكی مرۆیـیو ڕژێمـی سیاسـی، تـا مرۆڤـەكان هەموویان یەكسان بن لە پلەو پایـەو ڕاو ڕۆڵ بینیینـدا، هـەموویان بەنـدەی خـوای تاكو تەنهان یەكسانن و وەكو یـەكن، هـەموویان جێنیـشینی خـوان و شـەرعی بـۆ هەموویانە، هەموو ئەو ڕێیە دەبڕن كـە بـۆی بـەدیهاتوون، كـەوابوو كـەس لەكـەس بەرزترو چاكتر نییە، بە تەقواو لە خوا ترسیو بەشداری مـرۆڤ دۆسـتانەو كـاركردن بۆ ئاوەدانی نـەبێو بەدەسـتهێنانی ئاوەدانكردنـەوەو بنیادنـانی ژیـارو شارسـتانی نەبێ.

خـواى گـەورە پاداشـتى برامـان (د. عبدالمجيـد النجـار) بداتـەوە لەسـەر ئـەم ماندبوونـەى‌و ئـەوەى پێـشكەشى كـردووە ئومێـدەوارين خامـەى نووسـەرانمان بەردەوام بێت لە پێناو شيكردنەوەى ئەم بابەتانە، تـا ئـەم چـمكانە لـە هۆشـيارى ئومەتدا جێى خۆيان بكەنەوە ببنە بەشێك لە كـاراكردنى ئـەم بـوارە، ئـەو كاتـەش موسڵمانان دڵخۆش دەبن بەو سەركەوتنەى خوا دەيبەخشێ.

**وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين.**

**د. تەها جابر عەلوانى**
**بەڕێوەبەرى پەيمانگاى جيهانيى فيكرى ئيسلاميى**
**هێرندن - ڤێرجينيا**
**رەبيعى يەكەم/ ١٤١٣**
**ئەيلول/ ١٩٩٢**

# رێخۆشکردن

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ موسڵماناندا بە گشتی دەدوێت و دەفەرموێت (كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته فالامام راع وهو مسؤول عن رعيته، والرجل راع وهو مسؤول عن رعيته، والمرأة راعية على بيت زوجها وهي مسؤولة عنه، والعبد راع على مال سيده وهو مسؤول عنه، ألا فكلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته)[1] لەم فەرموودەوە ئەوە وەردەگرین کە موسڵمان بەرپرسە وەك فەرزی عەین، لە پاراستنی بەرژەوەندی موسڵمانان لە بازنەیەکدا، پێدەچێ بەرفراوان یا بەرتەسك بێت بەپێی ئەو شوێنەی تێیدا دەژی.

ئەم بەرپرسێتیەش خوازیاری رەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانە، ئەمەش وا دەخوازێت کە موسڵمان دەست پێشخەری بکات لە (را)داندا، بۆ ئەوەی ئەو چاودێرییەی لە ئەستۆیدایە بەشێوەیەکی کرداری دایڕێژێ کە بەرژەوەندییەکان لە واقعدا پارێزراو بن بە پێی خواستی بارودۆخە زەمەنییەکانی، بەم پێیە رادەربڕین لە لایەن موسڵمانەوە ئەرکێکە و بەرپرسبوونە بە حوکمو پێویست بوونی پاراستنی بەرژەوەندییەکان.

هەروەها بەدەستهێنانی هۆکاری گونجاوو پێویست بۆ رادەربڕینێکی تەندروست ئەمرێکی پێویستە لەسەر بنەمای (ئەوەی واجبی پێ تەواو دەکرێت ئەویش واجبە).

لەم سۆنگەیەوە لە کاتێکدا رادەربڕین بەم شێوە گشتگیرییە واجبە لەسەر موسڵمانان بەڵگەنەویستە ئەمەش دەبێتە هۆی بەدیهاتنی واجباتی کاتێ بەرپرسێتی چاودێری چەند لایەنە دەبن لە گۆڕەپانێکی هاوبەشدا.

---

[1] الإمام مسلم، كتاب الامارة ـ باب فضيلة الامام العادل ٨/٦، دار الآفاق الحديثة ـ بيروت.

هەرچەندە خالّی دەستپێکی و سەرەتای هەنگاو یەك بێت لەناو موسڵماناندا ئەو تواناو هۆکارانەی رایان پێدەدرێت خوازیاری چەند بۆچوونێن لە ئەندازەی پێویستدا لە زۆر کاتدا.

بەو پێیەی پاراستنی یەکڕیزی ئومەت ئەرکێکی ئاینیە، ئەمەش ئەرکی سەرشانی تاکی موسڵمانە (پاراستنی یەکریزی موسڵمانان) لە چوارچێوەی بەرپرس بوونی لە پاراستنی بەرژەوەندییەکاندا، لەم روانگەیەوە هاوکێشەکە هەندەك قورس دەبێتو پارسەنگی لەدەست دەدات لە نێوان ئەم دوو لایەیدا، ئەرکی رادەربڕین زۆر کات دەبیتە هۆی پەرتەوازەیی لە لایەکەوە، ئەرکی پاراستنی یەکڕیزی ئومەت لە لایەکی ترەوە، ئەوەی ئەم هاوکێشەیە ئالۆزتر دەکات لەوەدایە، هەر رایەك موسڵمان دەری دەبڕێت وەك ئاین دەخوێنرێتەوە، بەپێی ئەو گشتگیرییەی ئاینی ئیسلام و داگری بۆ هەموو لایەنەکانی ژیان، کەواتە ئەو ئیختیلافەی کە سەرەنجامی رادەربڕینە وەك ئەرکێکی ئاینی دەبێتە ئیختیلافێکی رووپۆشکراو بە ئاین، وێرای ئەوەی دەبێتە هۆکاری چەند دەستەبوونی ئەم ئومەتە.

لە مێژووی ئومەتماندا بیرۆکەیەك سەری هەڵداوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم هاوکێشەیە لەسەر حیسابی لایەنی یەکەم، تەنگی بە ئازادی رادەربڕین هەڵچنیوەو تەسکی کردۆتەوە، تا گەشتۆتە ئەو ئاستەی رادەربڕینی مراندووە لە پێناو پاراستنی یەکڕیزی ئومەتداو یەکبوونی، ئەم بەرتەسك کردنەوە هەردوو مەیدانی، کەسی رادەربڕی نێو موسڵمانان و بوارەکانی رادەربڕین لە خۆگرتووە، تا ئەو ئاستەی کۆتو بەندێکیان لە گەردنی ئالآن کە جار جار توندیان دەکردەوەو جار جاریش کەمێ شلیان دەکرد بە پێی بارودۆخ، تا هەموانی لە بازنەیەکدا خولاندەوە، لایەنێکی وەك نەهێشتنی ئازادی رادەربڕینو کورت هێنانی لە بوارێکی بەرتەسکی دەستی چەند کەسانێکی دیاری کراوو بابەتو بوارێکی سنووردارادا، ئەم بیرۆکەیەش کە (کپ کردنەوەی ئازادی رادەربڕینە) لە هەموو چەرخەکانی

دوای چەرخی زێڕینی یەکەمەوە تا ئەمڕۆش هەبووە و هەیە، بەڵام زیاترین پـشکی کــپ کردنەکــە لــە نــاو تەســەوفدا رەنــگ دەداتــەوە، کــەوا دەکــات موریــدو دەروێشەکانیان وەك مردووی بەردەم مـردوو شـۆڕبن‌و هـزرو بیریـان دەمـرێنن، وە لـەناو دیکتـاتۆری‌و تـاك رایـی سیاسـیی کـە بـە سروشـتی خـۆی راگـیراوە لەسـەر مراندنی دەنگ‌و رای بەرامبەرو ئۆپۆزسیۆن.

بەرامبەر بـەوەی کـە لـە قورئانـدا بـوار کراوەتـەوە بـۆ ئـازادی رادەربـڕین وەك بنەمایـەکی نـەگۆڕ لـە بنـەماکانی ئـاین، وا دەردەکـەوێ تـرس لـە لێکهەڵوەشـانی یەکڕیزی ئومەت لە زیادەڕوی ئازادی رادەربڕین ترسێکی پێـشکەوتووی نەخۆشـە، لەوەی کە پێویستە دەسـتی پێـوەبگیرێ لـە خۆپـارێزی رەوا کـە خـۆی لـە چـەند مــەرجێکی بیمــەکراودا دەبینــێ، تــا ئــازادی رادەربــڕین بەروبومــە شــەرعیە چاوەڕوانکراوەکەی پێبگات.

ئەوەش دەبێتە هۆی لەکارخستنی یەکێ لە هۆکارە بـەهێزەکانی نەشـونومای، چونکە رادەربڕین یەکێکە لە کەلێن پڕکەرەوەکان.

لـەم چـەند لاپەڕەیـدا دەمانـەوێ ئـەوە سـابت بکـەین، کـە ئـازادی رادەربـڕین بنەمایەکی قورئانیەو هیچ کات هۆکاری پەرتەوازەیی موسڵمانان نییە، وەك ئەوەی ئەوان لێی دەترسـن‌و لەبەرئـەوەش مراندوویانـە، یـا خەریکـە دەیمـرێنن، ئەمـەش دیکتاتۆرو ستەمکارە فکری‌و سیاسییەکان کـەڵکیان لێوەرگرتـووە، بەپێـچەوانەوە ئـازادی رادەربـڕین هۆکـاری یەکبوونـە، نـەك هــەر ئەوەنـدە بـەهێزترین هۆکـاری یەکبوونی موسڵمانانە لە روانگەی رواڵەتێك لە رواڵەتەکانی یەکبوونی ئیـسلامی کـە یەکبوونی هزریە ئەوە روون دەکەینەوە، بەوپێیەی کە یـەکبوونی هـزر یەکێکـە لـە گرنگترین رایەڵەکانی یەکبوونی نەتەوەکان بەگشتی‌و ئومـەتی ئیـسلام بەتایبـەتی، کەواتـە ئـازادی رادەربـڕین چـۆن دەبێتـە هۆکـارێکی گـرنگ بـۆ یـەکبوونی هـزری موسڵمانان؟؟

## ١ـ هزر:

له سەرەتای ئەم توێژینەوەیەدا جوانتر ئەوەیە چەمکی هزر بیناسێنین کە یەکبوونی هزری لەسەر بنیادنراوە، بەو پێیەی کە دەمانەوێ بیکەینە شوێنکاری ئازادی رادەربڕین، ئەوەش وامان لێدەکات پەنا بەرینە بەر ئەم پێناسەیە، چەند رەهەندی چەمکەکەیەو کەڵەکەبوونی مانا جیاوازییەکانیەتی کە بە تێپەڕبوونی زەمان بۆی کراوە، وای لێهاتووە رەها باسکردنی زۆرکات سەرلێشێوانی لێ پەیدا دەبێت، ئەو مانایەش کە ئێمە دیاری دەکەین بۆ چمکی (هزر) کە جێ مەبەستمانە کەمێك ناوازەیەو جودایە لەوەی کە ئەمڕۆ باوەو بەکاربراوی ناو خەڵکیە، بەڵام ئێمە بۆ ناساندنی پەنا دەبەینە بەر کۆمەڵە بنەمایەکی قورئانی پیرۆزو فەرهەنگەکانو زاراوە ئیسلامییەکان لە سەرەتای ژیاری ئیسلامی تا چەرخی ئیبنو خەلدون کە لە (مقدمە)کەیدا بەکاری بردووە.

لە فەرهەنگەکاندا هاتووە (فکر) بەکاربردنی تێڕوانینو بیرە لە شتدا[1] ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە (فکر) بریتییە لە بزاڤێکی زەینی کە بە (بەکاربردن دەربڕاوە) لە بابەتێکدا بۆ بە دەستهێنانی زانیاری لەو بابەتەدا، ئەمەش لە بابی (کیفیە ـ چۆنایەتیە) چونکە جوڵەی زەین چۆنایەتیەکە لە بابی (صور) و (معارف) نییە کە زەین لە خۆیانی دەگرێ.

لە قورئانی پیرۆزیشدا زۆرترین بەکاربراوی (بیرکردنەوە) و (لێکدانەوە) هاوکات لەگەڵ نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای گەورەو بەدیهێنراوەکانی لە بووندا هاتووە وەك: (كَذَلِكَ يُبيِّنُ اللّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ) (البقرة: ٢١٩)، (وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) (آل عمران: ١٩١).

---

[1] بڕوانە: ابن منظور ـ لسان العرب ـ فیروز آبادي ـ القاموس ـ وشەی (فکر).

کەوابوو بیرکردنەوە (بریتییە لە کاراکردنی زەین لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای گەورە بۆ گەشتن و پەی بردن بە حەقیقەتی بوونو سیفاتەکانی[1]).

(تفکر ـ بیرکردنەوە)و (فکر ـ هزر) هاومانان، چونکە (فَکَرَ و تَفَکَّرَ) هاومانان، ئیسلامیەکانیش هزریان بەم چۆنایەتییە بەکاربردووە کە خۆی دەبینێتەوە (لە بزاوتنی هزر بۆ گواستنەوە لە دیارەوە بۆ نادیار)، ئەوەش کە بە چەند دەربڕینێکی جیاواز دەربڕاوە کە هەمووشیان روویان لەیەك مانا و مەبەستە، هەریەك لە ئیبنو سینا (٤٢٨ك)[2]، فخرالدین رازی (٦٠٦ك)[3]، ئیبنو خەلدون (٨٠٨ك)[4]و سەید شەریفی جورجانیش (٨١٦ك) پوختەو پاڵفتەی کردووە لە (تعریفات)و دەڵێ: (هزر بریتییە لە رێکخستنی کۆمەڵە شتانێکی دیارو زانراو بۆ گەشتن بە شتانێکی نادیارو نەزانراو)[5].

لەم مانا چۆنیەتەدا ئێمەش چمکی هزر بەکاردەبەین، لەم توێژینەوەیەدا، مەبەستیشمان پێی ئەو پەیڕەوەیە کە عەقڵ لەبەری دەگرێ بۆ گەشتن بە مەعریفەت، بەم پێیەش هزری ئیسلامی بریتییە لە (ئەو پەیڕەوەی کە موسڵمانان بیری پێدەکەنەوە، یا ئەوەی کە دەبێت بیری پێ بکەنەوە، نەك ئەوەی بڵاوبۆتەوە ئەمڕۆ کە (بریتییە لە رێبازو رێڕەو و مەشق پێکردن کە ئیسلام

---

[1] بۆ نموونە بگەڕێرەوە بۆ: الزمخشري، الكشاف ٤٨٨/١.

[2] بڕوانە: ابن سينا ـ الاشارات والتنبيهات ٢٣/١، كە دەڵێ: (مەبەستم بە فکر لێرەدا ئەوەی لە نیازو مەبەستی مرۆڤ لە شتانێکی ئامادە لەزەینیدا، وێناکراو یا باوەڕپێکراو، باوەڕ پێی بوونی زانستی و یەقینی یا گومان، یا دانان و خۆبەدەستەوەدان، بۆ شتانێکی نادیار بڕوانە هەمان سەرچاوە ٣٧٩/٢.

[3] بڕوانە: الرازی ـ المحصل ٦٨، دەڵێ: (رێکخستنی کۆمەڵە زانستێکی دیار بۆ گەشتن بە چەند زانستێکی تر).

[4] بگەڕێرەوە بۆ: ابن خلدون ـ المقدمة، ٣٩٠.

[5] الجرجاني: التعريفات: ١٧٦.

هێنـاونی یـا دیدوبۆچـوونێ کـه موسـڵمانان بەدەسـتیان هێنـاوه... هتـد، کـه لـه چوارچێوەی ناوەرۆکی مەعریفەتو زانستی ئیسلامیدا خۆی دەبینێتەوه).

## ٢- یەکبوونی هزریی:

ئەگەر هزر بریتی بێ لە (پەیڕەوێك لـه تێڕامـانی عـەقڵی لـه پێنـاو گەیشتن بـه مەعریفه)، مەبەست یەکبوونی هزری نێوان کۆمـەڵێ لـه خـەڵکی هاوبـەش بوونیـان بێـت لـه ڕێبـازی تێڕامـانی عـەقڵی، بەشـێوەیەك چـەند تایبەتمەندییـەك کۆیـان بکاتـەوەو هاوبـەش بـن لـه سـیفاتدا، تاکـەکانی کۆمـەڵگا هەرچـەندە نزیـك بـن لـه یەکەوه خاڵی هاوبەش لە بواری پەیڕەوی بیرکردنەوەو نزیك بێـت زیـاتر بەیـەکیان دەبەستێتەوه، یەکبوونی هزریش نزیکتر دەبێت، بەڵام هـەرکات هـەرکام بـۆ خـۆی پەیڕەوێکی تایبەتی هەبێت لە بیرکردنـەوەو تایبەتمەنـدی خـۆی بێـت یەکبوونەکـه هەڵدەوەشێتەوەو هەرکام شەنی بایەك دەکـەن، دەکـرێ بـوترێ یـەکبوونی هـزری هەر ئومەتێ بەم مانایه، بنەمای سەرەکی یەکبونێکی گشتییه، چونکه راوبۆچوونه بیردۆزییەکانو پراکتیزه بـه بەرنامـەکانی ژیـان بـەروبوومی ئـەو پەیڕەوەیـه ئـەقڵ لەبـەری دەگـرێ بـۆ گەشـتن بەمەبەسـتەکانی، کەواتـه پەیڕەوەکـه چـۆن دەبێـت دەرئەنجامەکەش هەر ئەوه دەبێ، لەراسـتیو چـاکی و گـومڕاییو سەرلێـشێواوی، ئەمەش دەکرێ ببێته راڤەیەك بۆ ئەو پێداگرییه بەهێزەی قورئان لەسـەر ڕێنمـونی کردنـی عـەقڵ بـۆ تێڕامـان لـه نیـشانه بەرهەسـتیه بوونییـەکان، بـەکاربردنی وەك پەیڕەوێکی هزری بۆ گەشتن بە هەق لـه ناسـینی خـوای گـەورەو سـیفەتەکانی بـه شێوەیەکی یەکجارەکی، ئەمەش ئەو ڕێسایەیه که زانایانی عەقیـدە دایانڕشـتووه، که بریتییه لەوەی پەیڕەوی راستو دروست لـه هـزردا دەمانگەیەنێتـه هەقیقـەتو راسـتی، ئەمـەش ئـەو ڕێسایەی ئەبولمـەعالی جـوینی (٤٧٨ك) ئیمـامی حـەرەمین بڕیاری داوه، که دەفەرموێ: (تێڕوانینی راست ئەگەر وەك خـۆی لەسـەری بـڕۆی، هیچ لەمپەرێك نەبێتـه کۆسـپ کـه هەڵوەشـێنەری زانـست بێـت، زانـستو زانیـاری لەسـەر ئـەو بابەتـه بەدەسـت دێ بـەو ئەندازەیـەی کـه ڕێـساکانی وەك خۆیـان

جێبـەجێ کـردوون)[1]، بـەم پێیـە یـەکبوونی هـزری نێـوان ئومـەت دەبێتـە هـۆی یەکبوونی دیدو تێڕوانینو چارەسەرەکان لـە ڕێکخـستنی هەمـەگیری ژیانـدا، بـەڵام هەرکات فرەتێڕوانین دروست بوون، هەرکام تووله ڕێیەکی گـرت و پـەیڕەوەکانیش جودابوون، هەرکام بۆ خۆی دەرئەنجامێکی تایبەت بە خۆی دەبێت کە جودایە لـە تێڕوانین و بۆچوونی ئەوی تر، ئەمەش ئەو چـەند دەسـتەییو پەرتەوازەییـەی لـێ بەدی دەێ کە دەیبینین.

یەکبوونی هزری نێوان موسڵمانان لەسەر ئـەو پێناسـانەی باسـکران، هاوبـەش بوونی موسڵمانانە لە پەیڕەوو بەرنامە سەرەکییە گەورەکان بـۆ تێڕوانینـی عـەقڵی لە کاروباری بوونو ژیان بۆ گەشتن بەو ڕاستیەی کـە دەبێتـە بنـەمای چـۆنایەتیو پەیوەندییان بە بوونەوەو کاروباری ژیانیانی پێ ڕێك دەخەن، هەموو ئەمانـەش لـە چوارچـێوەی دەسـتووری ئاینـدا کەلەیـەك نەتـەوەدا کۆیـان دەکاتـەوە، کـورت هەڵهێنانی لە بنەما پەیڕەویە گەورەکاندا لەبەرئەوەیە، چونکە پـەیڕەوە لاوەکییـە پراکتیزیەکان پێدەچێت کاریگەری فراوانو ئەوتۆی نەبێت لەسەر یەکبوونی هزری، لەبەرئەوە ئێمە لەمەودوا زیاتر پێداگری دەکەین لەسەر ئەو خاڵو بنەمایانـەی کـە ئێمە پێمانوایە رایەڵن لە یەکبوونی هزردا.

ئـەم رایەڵـە مەنهەجیانـە بـەو ئەندازەیـەی بـڵاون لـە نێـوان موسـڵمانانداو وەك ڕێبازێـك بـەکاردەبرێن بـۆ تێڕوانینـی ئـەقڵیان، بـەو ئەندازەیـەش کـارا دەبـن لـە یەکخستنی هزری موسڵماناندا، بە پێچەوانەشەوە موسڵمانان چـەندە دوور بـن لـەو بوارەدا بەهـەمان ئەنـدازەش دەبێتـە هـۆی پەرتـەوازەیی و دووری و لێـك تـرازان، چـونکە ئـەو دەمـە هـەرکام تێڕوانینێکـی تایبـەتیان ئـەبێت جیـاواز لـە تێڕوانینـی ئـەوانی تـر، بـەو ئەندازەیـەی جیـا ڕا دەبـن، دەبێتـە هـۆی جیـاوازی دیـدگاو چارەسەرەکان کە بڕیاردەدرێن بۆ ژیان، لە مێژووی موسڵمانانیشدا ئەو ڕاستیەمان

---

[1] امام الحرمين ـ الارشاد: ٢٧.

پێش چاو دەکەوێت، کاتێ ژیانی موسڵمانان و پەیڕەوی کارکردنیان هەڵقوڵاوی قورئانی پیرۆز بوو، کە لە چاخی یەکەم و زێڕینی ئیسلامدا خۆی دەبینێتەوە دەبینین یەکبوونو یەکڕیزیی حاکمە بەسەر بارودۆخی ئەو چاخەدا، ژیانی دوای ئەوانیش کە دەستەو گروپەکان هاتنە گۆڕێو کەوتنە ژێر کاریگەری پەیڕەوی هاوردەو رۆشنبیری دەرەکی وەك دەستوری یۆنانی صوری، پەیڕەوی سوفی ئیشراقی کۆن، ئەوەی ژیاری رۆژئاوای نوێ هێناویەتی کە خۆی لە ژیانێکی مادیدا دەبینێتەوە.

## ٣ـ هۆکارەکانی یەکبوونی هزریی:

ئەگەر یەکبوونی فکری کۆمەڵێ لە خەڵك بریتی بێت لە هاوبەش بوونیان لە ئەدگاری بنچینەیی کە تێڕوانینی ئەقڵیان لەسەر بیناکراوە، وەك پێشتر باسمان کرد ئەو هۆکارە بنچینەییانە کە دەبنە هۆکاری ئەو یەکبوونە، کە خەڵکی دەبنە هاوبەش لە تێڕوانینیاندا یا تایبەتمەندیە بنچینەییەکان کامانەن؟

پێکهاتەی مەنهەجی هزری مرۆڤ بۆ هەوڵدانی لە پێناو مەعریفەی گریمانەو پراکتیزی بەشێوەیەکی بنەڕەتی کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو ئایدۆلۆژیایەی کە مرۆڤی لەسەر گەشەو نەشو نوما دەکات.

بیرۆکەی ئایدۆلۆژی لەمەڕ بوونو گەردوونو پاشەرۆژی مرۆڤ، ئەمانە دەبنە هەوێنی دروست بوونی دیدگاو بۆچوون، بەو مانایە ئەم فکر دروست دەکات، لەبەرئەوە نەتەوەکان لە پەیڕەو و بیرکردنەوەدا جیاوازن، چونکە بە تێڕوانینو ئایدۆلۆژیای جیاوازەوە شتەکان دەخوێننەوە، بۆ نموونە: فەلسەفەی یۆنانی لەسەر ئەوە بنیادنرابوو کە خواکان باڵادەستن لە جیهانی (جوزئیات)ی بەرهەست، هیچ شتێ لەکاروبارەکانی بەڕێوە نابات، هەروەکو چۆن بنیادنراوە لەسەر گەورە زانینی موجەرەداتی عەقڵی روحی، بێڕێز سەیرکردنو کەم زانینی مادەی

بەرهەست، ئەمەش بویە هۆی لە دایکبوونی پەیڕەوێکی مەعریفی بنیادنراوە لەسەر قوتار بوون لە کۆسپە مادیەکانو (صوری) وەك لە لۆجیکی (ئەرەستوی صوری) دا خۆی دەبینێتەوەو تەشەنەی سەندووە.

لە جیهانی هەلینیدا بە گشتی، کاتێ ئیسلام هاتو بیروباوەڕێکی هێناو بڕیاری ئەوەی دا کە خوای گەورە بەدیهێنەرەو بەڕێوەبەری هەموو جوزئیاتی جیهانی مادیو بەرهەست بەشێویەکی راستەوخۆ، وە مادەی بەرهەست بەڕێز ناوبراوەو سوك سەیر ناکرێت، بەو پێیە نومایشگەری دەسەلات و گەورەیی خودایە، ئەم بنەمایە بویە هۆی دروست بوونی پەیڕەوێکی مەعریفی کە لەسەر واقعیەت دروست کراوەو بۆتە خالّی سەرەتاو دەستپێك بۆ عەقلّ بۆ ناسینی راستیەکانو بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیان(1).

ئەم جیاوازیە لە فیکردا شوێنکاری قایلبوونە بە جیاوازی ئایدۆلۆژیا، ئەوەش گەورەترین هۆکارە لە پێکهێنانیدا بەتایبەتی کاتێ دەبێتە ئایدۆلۆژیایەکی ئاینی.

کەوابوو یەکبوونی هزری ئومەتێك یا کۆمەڵە خەڵکانێك دەرئەنجامی یەکبوونی ئایدۆلۆژیایانە، هەرکات روویان لەیەك رووگە نا، رووگەکانیان نزیك بوون لە یەکەوە سەبارەت بە تێڕوانین لە حەقیقەتی بوونو گەردوونو پاشەرۆژی مرۆڤ، پەیڕەوی تێڕوانین لایان واتە (هزر)، دەبێتە یەك تەوەری یەکبوو یا نزیك لە یەکەوە، لەبەرئەوە هەرکات پەیڕەوێکی مەعریفی بڵاوبێتەوە لەناو هەرگەلو هۆزێکدا دەبێتە هۆی هاوڕەگەزبوونی ئایدیۆلۆژی تێیدا، هەرکات گۆڕانکارێکی کتوپڕی یەکبوو لە ئایدۆلۆژیادا لە نێویاندا روو بدات ئەو دەم پەیڕەوێکی هزری یەکبووش دێتە دونیاوە، بەهەمان شێوەش ئەگەر پەرتەوزازە بوو لە بیروبڕوای فەلسەفی یا ئاینیدا دەبێتە هۆی دروست بوونی چەند رایی لە پەیڕەوی مەعریفیدا، ئەمەش ئەوەیە کە دامەنگیری ئومەتی ئیسلامی بووە لەمڕۆیدا، بە هۆی هێرشی رۆشنبیری

---

[1] بگەڕێرەوە بۆ: محمد اقبال، تجديد الفكر الديني في الاسلام، ١٤٦.

ڕۆژئاوا کە بۆتە هۆی ڕێکردن بۆ ناو تێڕوانینی بیروباوەڕیش، ئەمەش بۆتە هۆی دروست بوونی شپرزەیی لە پەیڕەوە مەعریفەکاندا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە لەناو ئەم ئومەتەدا کەسانێ هەبن لەسەر بیروباوەڕێکی جودا لە بیروباوەڕی ئومەت بژین، ئەم کۆمەڵە، وێڕای ئەوەش، گونجاون لەگەڵ ئومەتدا لە یەکبوونی هزریدا یا هاوشێوەی یەکبوونی هزری، ئەمەش بە هۆی تێوەچوونی کەلتوری قوڵ، ئەوەی وتمان ئاراستە کراوە لەسەر گشتگیری.

یەکبوونی هزری موسڵمانان بەدەر نییە لەوەی نووسیومانەو باسمان کردووە، بەڵکو زۆر ڕاست دەردەچێ لەسەر ئومەتی ئیسلامی، هۆکاری ئەم یەکبوونە بیروباوەڕی ئیسلامیە کە موسڵمانان کۆدەکاتەوە لەسەر تێڕوانینێکی یەکبوو سەبارەت بە بوونو گەردوونو پاشەڕۆژ، ئەوەش تێڕوانینێکی تایبەت بە خۆیەوە، چونکە ڕاگیرە لەسەر یەکخواناسی ڕەها، ئەم بیروباوەڕەی کە موسڵمانانی یەکخستووە لە ڕووی ئایدۆلۆژیاوە هەمان هۆکاریش دەبێتە پاڵنەر بۆ عەقڵەکانو ڕێکخستنیان لەسەر ئاکاری مەنهەجی لە تێڕوانینی مەعریفی هاورەگەز، هەموان بە هۆیەوە یەك شێواز بیر دەکەنەوە بەمەش دەگەنە یەك شێوە لە دیدوبۆچوونو چارەسەر لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیاندا، کۆمەڵە کەسانێك بە دوای یەکدا هاتنو بوونە هەڵگری ئەم بیروباوەڕەو خۆیان داماڵی لە بیروباوەڕو کەلتوری ئاینیو فەلسەفی جۆراوجۆر، بەم بیروباوەڕە نوێیەش کە شۆڕشێکی مەنهەجی تێدا دروست کردن، بوو بە هۆی یەکبوونیان لە هزردا، چەندین نووسراوو هونەرو ئاوەدانیان پێ دروست کردو بنیادنا، لە ژێر سایەی ئەم بیروباوەڕەشدا ئەوەی لادەربوو لێی وەك جاهلی یا بت پەرست یا گاور یا جو یا ئاگر پەرست بە یەك چاو سەیر کرا، ئەمەش سایەی سێبەر و بیروباوەڕی ئیسلامی بوو، کە ئەو هۆکارە بوو هزری ئیسلامی یەکخست لەسەر چەند ئاکارێکی مەنهەجی کە لە ڕایەڵەکانی یەکبوونی هزری نێوان موسڵماناندا نومایش کراوەو بینراوە، ئەم ئاکارانە چەندە پیادە کرابن لە نێویاندا یەکبوونەکەش هێندە بەهێزە، بە پێچەوانەشەوە ئەم

ئاكارانە چەندە لاواز بن لە نێویاندا هێندەش پەرتەوازەو دوورلەیەك دەبن، دەبێت ئـەو رایەڵـە بنـچینەییانە چـی بـن کـە دەبنـە هۆکـاری یـەکبوونی هـزری نێـوان موسڵمانان؟

## ٤ـ رایەڵەکانی یەکبوونی هزریی نێوان موسڵمانان:

عەقیدەی ئیسلامی وەك لەوەی کە لـە قورئـانو سوننەتدا باسـکراوە، لـە نـاو هەڵگرانیـدا کۆمـەڵێ ئاکـاری فیکـری بەرنامـەیی بـەدی دێنـێ، کـە دەتـوانن بـە هەموویانــەوە روکـارێکی لـە یـەکبوونی هـزری بـەدی بێنـێ، کـە دەبنـە هـۆی هاورەگـەزبوون لـە چارەسـەرکردنی بـیردۆزیو پراکتیکـی بـۆ موسـڵمانان کـە سەرتاپای ژیانیان لە خۆ دەگرێ، ئەگەر ئەو ئاکارانەی باسیان دەکەین هـەڵقوڵاوی سروشتی عەقیدەیی ئیـسلامی یـەکگرتووە، ئەمـەش وا دەخـوازێ کـە هـەڵگرانیش یەکگرتوو بن، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کـە موسـڵمانان لـە واقعـدا هەمیـشە یـەکبوو بوون، بەڵکو لە زەمەنێکدا ئەو یەکبوونە هاتۆتـە گـۆڕێ هـەروەکو چـۆن لـە چـەند فەترەیەکی زەمەنیشدا تێکچوون و چەند ریزی بەخۆوە بینیوە، گومانی تێدا نییـە پڕاو پڕ وەرگرتنی عەقیدەی ئیسلامی گەورەترین هۆکارە بۆ بـەدیهاتنی یـەکبوونی هزری نێوان موسڵمانان، هەروەکو چۆن کۆمەڵە هۆکـارێکی گرنگـی دیکـەش رۆڵـی بەرچاویان هەیە وەك ئازادی رادەربڕین، کە دواتر روونی دەکەینـەوە لـە گـرنگترین رایەڵەکانی یەکبوونی هزری کە عەقیدەی ئیسلامی بەدی دەهێنێ بریتین لە:

**أ ـ گـشتگیریی تێـڕوانین:** مەبەسـتیش بەمـە روونـانی عەقڵـە بـۆ توێژینـەوەی کۆمـەڵێ پـرس بـە تێڕوانینێکـی گـشتگیرانەو لـەخۆگرتنی هـەموو لایەنـەکان، وەکۆکردنەوەی هەموو ئەو شتانەی کە شوێنکاری ئەو دەبن، لە پێناو گەشـتن بـە تـەواوی ئـەو مەبەسـتو توێژینەوانـە، بـە دواداچـوونی دەرئەنجامـەکان لـە بابـەت توێژینەوەکان و کۆکردنەوەی ئەوەی پەیوەستە بەوەوەو لە کاتی گەڕان بە دوایدا دەبێتە هۆی روونکردنەوەی رێگاکەو دەرکەوتنی راستی.

بەڵام تێڕوانینی لاوەکی‌و بەش بەش‌و کورت هەڵهێنراو لەسەر هەندێ لە بابەتەکان دەرئەنجامەکەی راوبۆچوونێکی ناکامڵ‌و ناتەواو دەبێ‌و ناگاتە ئەو حەقیقەتەی کە مەبەستە پێی بگەی، عەقیدەی ئیسلامی مەبەستیەتی عەقڵێك پەروەردە بکات کە گشتگیرو هەمەلایەن بێت، رێبەرە ئیسلامییەکان رێبەرێکی گشتین، لە باسکردنی ئەوەی پەیوەندی بە بوون‌و ئەوەی کە پێویستی ژیانی مرۆڤەوە هەیە، قورئانی پیرۆز رێنمونی هزر دەکات بۆ تێڕامان‌و تێڕوانینی گشتی بۆ (بوون) لە رووی بەدیهێنان‌و رێساو یاسا و جموجوڵ‌و پێکهاتنیەوە، بۆ دۆزینەوەی یاساکانی لە خودی خۆیدا، وە بەڵگە بوونیشی لەسەر ئەو دیوی خۆی، هەروەکو چۆن سەرەنجی مرۆڤ رادەکێشێ بۆ سەرنجدان لە مێژووی نەتەوەکان بە گشتی‌و خوێندنەوەی هەمەلایەنە.

یەکێ لەوە گشتگیریانەی عەقیدە، ئەو رێنمونیە قورئانیانەی بۆ تێڕامانێکی هەمە لایەنانە بە کرداری بنەمای ئاکارێکی لە عەقڵیەتی ئیسلامیدا بینا کردووە، کە بۆتە تایبەتمەندییەك لە تایبەتمەندیەکانی هزری ئیسلامی بەروونی لە کەلەپوری زانستی موسڵماناندا بە هەموو لق‌و پۆپێکەوە دەبینرێ‌و بەدی دەکرێ، بە نموونەیەك ئەو راستیە دەسەلمێنن، ئەو کارانەی موفەسرین و راڤەکارانی فەرموودە ئەنجامیان داو، بۆ گەشتن بە حەقیقەتی مەبەستی خوایی لە دەقەکاندا، کە هاتون توێژینەوەیان کردووە لەسەر دەقەکان لە رووی زمانەوانی، ژیربێژی، مێژووی، کە خۆی لە هۆکانی هاتنە خوارەوەدا دەبینێتەوە، حیکمەت و فەلسەفە کە خۆی لە زانستی ماتماتیك‌و زانستە گەردوونییەکاندا دەبینێتەوە، دواتر ئەوانە هەموو بەکار دەبەن بەشێوازێکی ناوازە بۆ گەشتن بە حەقیقەت و راستی، وەك ئەوەی لە تەفسیری (فەرخی رازی)دا دەیخوێننەوە، کە هەموو ئەو زانستە باوانەی سەردەمی خۆی بەکاربردووە بۆ گەشتن بە راستیە قورئانیەکان.

(طاش کبری زادە) لە سەرەتای ئینسێکلۆپیدیاکەی خۆیدا ئەم تایبەتمەندییە (گشتگیریە)ی بە جوانترین شێوە وەسف کردووە، ئەوە روون دەکاتەوە

موسـڵمانان بـه دوای راسـتییدا گـەڕاونو توێژینـەوەیان لەسـەر کـردووه لـه چـوار ئاستیدا، بوونی به شێوەی بەهەرست له دونیای واقعدا، بوونی لـه زەینـدا، بـوونی له لایەن بیژیەوه له دەربڕیندا، بوونی لـه رووی نووسـینەوەی لـه بـەراوردا، دواتـر ئەمەی کردۆته بنەما بۆ هەڵبژاردنی زانستەکان[1].

گومانی تیدا نییه سیفاتی گشتگیری له روانگەی تێڕوانینو بینیندا سیفەتێکی هاوبەشی نێوان ئەوانەیە تێڕوانینی بۆ دەکەن، چونکه به زۆری یەك بۆچوونی له خۆدەگرێ له رووی مەبەست بوون بۆ گەشتن به راستییەکی زانستی، یا بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی پێش دێن له ژیاندا، لەم کاتەدا هەموو تواناکان خۆیان دەبیننەوه لەو یەك رێبازدا له چوارچێوەی بزووتنەوەیەکی ئاوەدانکردنەوەدا، بەڵام پەیڕەوی لاوەکی و یەك لایەنه که زۆرێك له بەدەست هێنراوەکان پشت گوێ دەخات دەرئەنجامەکانیشی هەڵەیان تێدا دەبێ، که ئەمەش دەبێته هۆی پەرتەوازەیی‌و دەسته دەستەیی.

پێدەچێت جودابوونەوەی خەواریجو شکاندنی ریزه یەکگرتووەکانی سـەردەمی ئیمامی عـەلیو دواتـر شۆڕشـه یـەك لـه دوای یەکـەکانیان، دەرئـەنجامی پـەیڕەوی لاوەکی ناگشتگیر بـوو کـه بـەکاریان دەبـرد لـه تێگەیـشتنی دەقـەکانی قورئـانو جێبـــەجێکردنی حوکمەکانیـــدا، تـــەنها رووکـــاری دەقـــەکانیان دەخوێنـــدەوەو نەدەچوون به دوای تێگەشتنەکانو چۆنیەتی جێبەجێکردندا، ئەمەش بوویـه هـۆی تـــەکفیرکردنی ئـــەو موسـڵمانانەی لەگەڵیانـدا نـەبوون، ئـەم تەکفیرکردنـەش وای لێکـردن چـەندین شـۆڕشو جـەنگو کوشـتار بـەرپا بکـەن، ئـەمڕۆش هاوشـێوەی خـەوارج هـەن کـه پـەیڕەوی گـشتگیرییان هەیـه لـه تێگەشـتندا کـه بۆتـه هـۆی دروستبوونی پەرتەوازەیی‌و گروپ گەرایی لەناو موسڵماناندا[2].

---

[1] بگەڕێرەوە بۆ: طاش کبری زادە، مفتاح دار السعادة، ١/ ٧١و دوای ئەوە.

[2] ئەو پەیڕەوە لاوەکییەی خەواریج به روونی دەردەکەوێ کاتێك لەگەڵ ئیبنو عەبباسدا گفتوگۆ دەکەن، که ئیمامی عەلی ئیبنو عەباسی نارد تا بەڵکو قایلیان بکات و بگەڕێنەوە، بۆ زیاتر تێگەیشتن.

ب ـ **هاودەمبوون و یەکڕیزیی:** مەبەستمان بەمەش ڕێنمونی کردنی عەقڵە بۆ گەڕان بە دوای هەقدا بەشێوەیەك کە هاوئاهەنگی دروست بکات لە نێو ئەو ئاکامانەی بە دەستیان دێنێ، وە هەندێکیان بداتەوە پاڵ هەندێکی تریان، بەپێی هاوشێوە بوونو وەك یەك بوونیان، دواتر یەکیان بخات لە پێوانەیەکی بەڵگەییدا کە ببێتە بنەمایەك بۆ یەك مەبەست بە شێوەیەك تێگەیشتنو هۆدەرخستنەکان بچنە ناو یەکەوە، وە لەسەر ئەمەشەوە تێڕوانینو چارەسەرەکان بنیاد بنرێن، ئەم تایبەتمەندییە وا دەکات کە حوکمە مەعریفیەکان یەك پێوەر بن، ئەو دەمەش ئەنجامەکان هاوشێوە دەبنو لێك هەڵوەشانەوەیەك لە ئارادا نابێ، ئیتر ئەو مەعریفەتە گەردونی بێت کە ڕێساو بنەمای یەکبوو دروست دەکات لە ئەزموونـدا، یا مەعریفەتی شەرعی مرۆیی بێت کە یەکبوونی بنەماو ئەنجامی لەسەر بنیاد دەنرێ، بەڵام هەر کات عەقڵو هزر دوانەیی مامەڵەی کرد و گوێی بەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتییانە نەدات، ئەو دەم دەگاتە دەرئەنجامێك کە بە گژدایەکچوونی تێدا دەبێت، زۆر کاتیش دوور لە ڕاستییە.

لە عەقیدەی ئیسلامیشدا هانی ئەوە دراوە کە عەقڵەکان بنیاد بنرێ لەسەر خۆشەویستی و یەکبوون لە دیدو تێڕوانیندا، چونکە ئەم عەقیدەیە لەسەر یەکتاپەرستی ڕەها بنیاد نراوە، ئەوەی لە بووندا هەیە سەرەتاکەی یەکێکە وێڕای زۆری و جۆراو جۆری، فرە ڕێسایی لە پێکهاتنو جموجوڵیدا، وە دەرکەوتن و دەرنەکەوتن دا هەمووی بەپێی یەك ڕێسا ڕێ دەکەن، بەرەو یەك ئامانجیش هەنگاو دەنێن، ئەوەش خوای گەورەی بەدیهێنەرو یاسارێکخەر، هەمووی بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، ژیانی مرۆڤیش بە هەموو گۆڕانکارییەکانەوە رووی لەم واقعگەراییەیە کە بریتییە لە پیادەکردنی جێنشینایەتی لەسەر زەویدا بە

---

بگەڕێرەوە بۆ: المقدسي ـ البدء والتأريخ ٢٢٣/٥و البغدادي ـ الفرق بين الفرق: ٥٨، کە گفتوگۆیەکی هاوشێوەی تێدایە لە نێوان ئیمامی عەلی و خەواریجدا.

پەرستنی تەنها خوا، ئەم پێوەرە یەکبووە کە عەقیدەی ئیسلامی لەسەر بیناد نراوە دەبێتە هۆی ئامادەکردنی عەقڵ، هزری بڕوادار لەسەر یەکبوونی و هۆگری لە تێگەیشتن و حوکمدان و هۆهێنانەوەدا، ئەم تایبەتمەندییە مەنهەجییەش لەسەردەمی گەشەی ئیسلامیدا بە روونی دیارە، ئەمەش لەوەدا دیارە کە هەموو زانستەکان لەسەرەتای نووسین‌و قۆناغەکانی گەشەسەندنیاندا لە خزمەتی قورئان‌و بابەتە یەکبووەکانیدا بوون، هەر بابەتێکی شەرعی یا مرۆیی، یا گەردوونی، هەموان هزری مرۆڤیان وەبەرناوەو بەهێزکردووە لە کاروانی رێکردنیدا بۆ تاکە مەبەستێك کە خۆی لە یەکخستنی ژیانی مرۆڤدا دەبینێتەوەو ئەمەش لە نووسراوەکانی (إبن خلدون و طاش کبری زادە)دا زۆر بە جوانی روون‌و دیارە[1].

لەم تایبەتمەندییە مەنهەجییەدا ئاسەوارێکی یەکبوونی لە هزردا بەدی دەکرێ، پشت بەستن بەوە کە یەك بوون لە دەرئەنجامدا، وە لەبەرگرتنی سەرەتایەکی یەك بوو لە شیکاری‌و بنیادنانی مەبەست، دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ئەنجامی هاوبەش یا نزیك، وە بۆ حوکم‌و رێ چارەی هاوشێوە، هەموو ئەوانەش بەم پەیڕەوە هەنگاو دەنێن یەکدەگرنەوەو بەرەو مەبەستێك رێ دەکەن لە بەدەستهێنانی ژیاندا، ئەمەش بە روونی لە سەردەمی شارستانی ئیسلامدا لە چاخی زێڕیندا دیارو بەرچاوە، ئەمەش لە ژیانی هەموو موسڵمانانەدا لەوپەڕی وڵاتەوە بۆ ئەمپەڕی بینراوو، ئەو موسڵمانەی لە ئەندەلوسەوە دەست پێبکات لە بواری ئاوەدانکردنەوەی ئەندەلوسدا لە رووی زانست‌و هونەرو پیشەسازییەوە، دواجار بێتە ماوەرای نەهر یەك شت دەبینێ‌و شتێکی بەرچاو دەکەوێ، نموونەی زۆرتریشمان هەن لەم بوارەدا، دۆگمایی پێوانەیی لە شیکاری مەبەستدایە دەبێتە هۆی کێشمەکێش‌و بگرەو بەردەو بەرەو دوا گەڕانەوە، دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی، جوانترین نموونەشمان واقیعی ئەمڕۆی موسڵمانانە کە هەریەك شەنی بایەك دەکات و بەهاو نەریتی غەربیش رێی کرۆدتە ناوماڵەکانمانەوە.

---

[1] بڕوانە: ابن خلدون، المقدمة، ٤٠١، ٤٥٧. طاش كبرى زاده ـ مفتاح دار السعادة، ٥٩٨/٢.

ج ـ واقعیبوون: مانای ئەوەیە هزر لە هەنگاونانیدا بۆ ناسینی هەق پەیڕەوێکی واقیعی هەبێت، ئیتر واقیعێکی گەردوونی یان دەروونی یا مێژوویی بێت، ئەو دەمە واقیع دەبێتە هۆکار بۆ دەرکەوتنی دەرئەنجام، ئەو دەرئەنجامەش هەرچی بێت، یا پێشبینی ئەوەی کە دەبێ، یان بە هەنگاونان لە دیاردە بەرهەستە گەردوونیەکانەوە بۆ یاساو رێسا گشتییەکان لە رێی ئەزموونەوە، یا بە هەنگاونان لە نیشانەو شتە مادیە بەرهەستەکانەوە بۆ هێما غەیبیەکان لە بەدیهێنان‌و بەڕێوەبردن، یا بە هەنگاونان لە واقیعی ژیانی مرۆڤ مێژووی یان هەنوکە بۆ دیاری کردن و دەستنیشانکردنی ئەوەی کە دێتە گۆڕێ لە چاکەو راستێتی.

ئەم پەیڕەوە مەنهەجییە دژە لەگەڵ تایبەتمەندی صوورەری، ئەمە وادەکات خاڵی دەستپێکی هزر لە بزاڤی مەعریفیدا صوورەری بێت، بەشێوەیەك هاوئاهەنگیەکی ئەوتۆ بنیاد بنێ کە لەگەڵ واقیعدا بێت‌و بتوانێ واقیعیانە رێ بکات ئەمەش وای کردووە نەتوانێ رێ چارەی گونجاوی پێ بێت بۆ ژیانی خەڵك، ئەمەش تایبەتمەندی فکری یۆنانی بوو، وەك ئاماژەی بۆ کرا.

قورئانی پیرۆز هات بۆ ئەوەی فکری ئیسلامی بەشێوەیەك بنیادبنێ کە واقیعی بێت، کە ئەمەش لە خودی خۆیدا شۆڕشێکی مەنهەجی بوو لە مێژووی هزری مرۆییدا، هزری هان دا لە پێناو ناسینی راستییە شاردراوەکاندا کەڵك لە دیاردە گەردیلە بەرهەستەکان و واقیعی دەروونی مرۆڤ وەربگرێت، خوای گەورە دەفەرموێ: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ) (فصلت: ٥٣)، وە لە پێناو دارشتنەوەی ژیاندا رێنمونی کرد بۆ داڕشتنی بەشێوەیەك گونجاو بێت لەگەڵ واقیعی مێژووی نەتەوەکانداو ژیانی هەنوکەیی هەر گەل‌و نەتەوەیەکدا، خوای گەورە دەفەرموێ: (قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ) (الروم: ٤٢)، وە دەفەرموێ: (انظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَلَلآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلاً) (الإسراء: ٢١).

لەسەر بنەمای ئەم رێنمونیە قورئانییە لای موسڵمانان تایبەتمەندیەك دروست بوو لە هزردا وای كرد واقیعی گەردوونیو مرۆیی ببێتە خاڵی دەستپێك بۆ هەر مەعریفەتێك، لەمەوە زانستی سروشتی دروست بوو كە دەرئەنجامی پەیڕەوی ئەزموونی بوو، وە زانستی حوكمی فقهی هاتە گۆڕێو خاڵی دەستپێك دیاری دەكات بۆ ژیانی خەڵكی لە بارودۆخو باوو نەریتو ... هتد، ئەم واقعیەتەش بوویە بنەما بۆ مەنهەجی ئەزموونی نوێ كە ژیاری رۆژئاوای لەسەر بنیاد نراوە كە (رۆجەر بیكون) لە ئەزموونگەرا ئیسلامیەكانی وەرگرتبوو[1].

گومانی تێدا نییە كـە واقعیگـەرایی هۆكـاری یـەكبوونی هزرییـە، چـونكە ئەمـە دەبێتە بناغەی حوكمدانی بابەتیانە، ئەو دەمەش زانیارییـەكانی نێـوان تێبینـەران یەك دەبن، ئەوجار بوارێكی فراوان دەڕەخسێ بـۆ یـەكبوونی ئەنجامـەكان، بـەڵام پەیڕەوی (صـوری) زۆركـات دەبێتـە هـۆی لێكـدان لـە تێڕوانینـدا، چـونكە لەسـەر گریمانو ئەگەر بونیاد نراوە، كە زۆر جاریش خودی تێدا رەنگ داوەتەوە، ئەمـەش لە یۆنانییەكاندا بە جوانی دیارەو بەدی دەكرێ، لە فرە بۆچـونیاندا سـەبارەت بـە سەرەتای بوون، كاتێ هەندێ لە بیریارە ئیسلامییەكانی وەك فارابیو ئیبنـو سـینا كەوتنە ژێر كاریگەری لۆژیكی (صـوری) یۆنانییـەكان، بیروبۆچـوونێكی رێزپـەریان داهێنا كە بە دووربوو لە كوژمە واقگەرا گشتییەكە، لە ناو ئومەتی ئیسلامیـشدا لـە كاتـانێكی جیـاوازدا كۆمـەڵانێك دەردەكـەون (صـوریو (مثـالي) لـە هـزردا رایـان دەكێشێ بۆ بنیاندنانی تێڕوانین و بۆچوونی لە چاكیسازییدا كە باز بەسـەر واقعـی خەڵكیدا دەدەن، چەند هیواو بنەمایەكی ناواقعی دروست دەكـەن، ئـەو بانگـەوازو بیروبۆچوونانەیان زۆر كات دەبێتە هـۆی دروسـت بـوونی ژڵـەژانو دڵـەراوكێ لـەناو ئومەتدا، واقعی ئەمڕۆشمان كۆمەڵانی لەو بیروبۆچوونو گروپانەی تێدان.

---

[1] بڕوانە: محمد اقبال، تجدید الفكر الدیني في الاسلام، ل١٤٨و دوایی.

**د ـ رەخنەگەرایی:** مانای ئەوەیە کە عەقڵ و هزر لە بزاوتی مەعریفیدا ڕێبازێك بگرێتە بەر کە هەموو ڕاجیاوازو بەرامبەرەکان کۆبکاتەوە، وردەکاری بکات نێوان هەموو ئەگەرە جیاوازەکاندا، پاشان هەڵیانچنێ و لەسەر بنەمای ئەو بەرامبەرکێ پێ کردنە تاقیان بکاتەوە، ئەم بەراوردو رەخنانە هۆکاری گرنگن لە ڕێنمونی کردنی هزردا بۆ گەشتن بە ڕاستی.

قورئانی پیرۆز لە باسکردنو گەیاندنی عەقیدە هزر لەسەر رەخنە پەروەردە دەکات، ئەمەش بەوەی زۆرجار عەقیدەی ڕاستەقینە بەراورد دەکات لەگەڵ بەرامبەرە پوچەکان کە هەڵگرانیان بەرگرییان لێدەکەن، پێك کێشانێ دەکات لەنێویاندا، پاشان هەق لە بەتاڵ پاك دەکاتەوە بە بەڵگەی بەهێز، ئەوەش لە قورئانی پیرۆزدا واهاتووە: (وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللّهِ وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللّهِ ذَلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِؤُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ قَاتَلَهُمُ اللّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ) (التوبة: ٣٠) و دەفەرموێ: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ) (لقمان: ٢١).

لەسەر ئەم ڕێنموونیە قورئانیەوە لای موسڵمانان ئاکارێکی بەراوردکردنی رەخنەگرانە دروست بووە کە توانیویانە زانستی پێشنیان لەخۆ بگرن، ئەوەی لەگەڵ عەقیدەیا گونجاوە و ئەوەشی نەگونجاوە، پاشان داویانەتە بەر توێژینەوەو پاککردنەوەو بەرامبەرکێیان پێکردون لەگەڵ بیروبڕوای ئیسلامیدا بێ وەلاخستنو دوورخستنەوەی هیچ شتێ لەوانە.

جار دوای جار گەڕاونەتەوە بۆیان بە چاوێکی رەخنە ئامێزەوە ئەوەی ڕاست بووە ڕاستیان لێداوەو ئەوەش ساختە بووە مۆری ساختە بوونیان لێ داوە، ئەمەش بە جوانی لە ئیشەکانی ئەبو حامدی غەزالی (٥٠٥ك) روونو دیارە لە پەڕاوی (مقاصد الفلاسفة)و (تهافت الفلاسفة)دا.

هەروەها لە نووسراوەکانی ئیمام ئیبنو تەیمیە (٧٢٨ك) لە پەڕاوی (نقض المنطق)و زۆر نووسراوی تردا.

کاتێ لەبەر هەر هۆیەك بێت کورت هەڵهێنانی لە ئاسۆی هـزری هەنـدێ گروپـی ئیسلامیدا دروست دەبـێو عـەقڵیان ڕێ نـادات لـە پێـچەوانەی بیروبۆچـوونەکانیان ببیستێ ئەو دەمە هزری ئەوان دەبێتە ڕاستەهێڵێ کە تەنها توانای وەرگرتنی یـەك ڕایان دەبێ، کە دەبێتە هۆی بەرپەرچدانەوەی ڕای بەرامبەر، کە دەرئەنجامەکەش دژوەستانێ لە نێو ڕیزی موسڵمانان دروست دەبێو دەبێتە لانکی لـە دایك بـوونی گرووپو دەستەو تاقم.

دەمارگیری ئایینزایی کە موسڵمانانی پێوە گیرۆدە دەبوون بـە درێـژایی مێـژوو یەکێکە لـە رووکارەکـانی ئـەو بەرتەسـك کردنـەی هـزر، ئـەمڕۆی ئێمـەش دیمـەنو شـێوازێکی وای تێـدا بـە دی دەکـرێ، وەك ئـەو یـەکتر نەخوێندنـەوەی نێـوان ئاینزاکان.

**هـ ـ بابەتیبوون:** مەبەستمان بەمە ڕەهاکردنی عەقڵە لە هەوڵەکانیدا بۆ گەشتن بـە حەقیقـەتو ڕاسـتی، لـە هۆکـارە خودیـەکان کـە دەبنـە هـۆی لەکارخـستنی خۆرسکی هاندەر بۆ ڕاسـتی، وە مامەڵـە لەگـەڵ بابەتەکـەدا بکـات وەك بابـەتێکی دەرەکی سەربەخۆ، کە ڕەگەزە خودیەکان هانی بدەن بە مامەڵە بێلایەنیانـەی بـۆ گەشتن بە ڕاستیو حەقیقەت.

قورئـانی پـیرۆز بانگەشـەی خـەڵکی کـردووە بـۆ ڕەهـابوونی عـەقڵ لـە کـاتی تێڕامـانو توێژینـەوەدا لــە هۆکـارە خودیـەکان کــە دەبنــە پــەردەی بــەردەم ڕاستیەکان، گرنگترین هۆکاریش لە نێو ئەمانەدا هۆکاری ئارەزوو و نەفسە، کـە لـە قورئاندا چەند جار داکۆکی لەسەر خۆبەدوورگرتنی لێکراوە (فَـلاَ تَتَّبِعُـواْ الْهَـوَى أَن تَعْدِلُواْ) (النساء: ١٣٥)، (فَـاحْكُم بَـيْنَ النَّـاسِ بِـالْحَقِّ وَلَـا تَتَّبِـعِ الْهَـوَى فَيُـضِلَّكَ عَـن سَبِيلِ اللَّهِ) (ص: ٢٦) و هۆکـاری لاسـایی کردنـەوەو چـاولێکەری باووبـاپیرە، کـە قورئان بە توندی دژی وەستاوەتەوە وەك (وَكَذَلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَـةٍ مِّـن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ * قَـالَ أَوَلَـوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَى مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ آبَاءكُمْ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِـهِ كَـافِرُونَ) (الزخـرف: ٢٣ـ ٢٤).

کاتێ خەڵکی لە پـەیڕەوی مەعریفیـدا هۆکـارە خودیـەکان وەلادەنـێن وە پـەنا دەبەنـە بەربابەتیانـەو بـەپێی زانیاریيـەکانی هەڵوێـست وەردەگـرن ئەمـە وایـان لێدەکات بگەنە تێڕوانین و حوکمی یەکبوو کـە بابەتەکـە بەسـەریاندا دەیسەپێنێ، ئەمــەش دەبێتــە هــۆی دروســت بــوونی بنەمایــەکی هاوبــەش لــە بــەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا، ئەمەش بـارودۆخ و ژیـانی موسـڵمانان بـوو لـە سـەردەمانی گەشـەو چاخی زێڕینی دا، کە هەموویان هاوبەش بوون لە گەشـتن و بەدەسـتهێنانی بناغـەو بنەمای سەرەکی لە رێکخستنی ژیانیاندا، وەك بنەما فیقیهییەکان لە خواپەرستی و سەوداو مامەڵەوو سیاسەتی شەرعیدا، جیاوازی و راجیاییشیان تەنها لە لاوەکیەکی سادەدا بوو، بە هۆی جیاوازی زانیارییەکان و داتاکان نـەك هۆکـاری خـودی، بـەڵام بارودۆخێکیان لە هەندێ زەمەندا بەسـەرهات لـە پێـوەری خودیـدا کـە بویـە هـۆی هەڵوەشــاندنەوەی یــەکبوونی هزریــان، دیــارترین شــێوازی ئــەم دیاردەیــەش بڵاوبوونەوەی (تصوف)ە کە بووتە هۆی بڵاوبوونەوەی (خودی) لە مەعریفەتدا کـە ناچێتە ژێر هیچ رێساو یاسایەکەوە، ئەمەش بوویـە هـۆی دروسـت بـوونی رێـچکەو رێباز لە رێکخستنی ژیاندا.

ئەوەش ئەمڕۆ بەدی دەکرێ و دەبینـرێ لـە چـاولێگەری کێـشان و پێوانـە بـە پێوەری رۆژئاوا کە هەندێ لە گروپە ئیسلامییەکان پـەیڕەوی دەکـەن بۆتـە هـۆی دورکەوتنەوەی ئەمانیش لە تێڕوانینـی بابەتیانـەی راسـت و دروسـت، ئەمـەش وای کردووە دەستەو گروپ و تاقم دروست بێت. ئەم پێنج رایەڵـە مەنهەجیـەی باسمـان کردن کە پێمان وایە دەبنە هۆی یەکبوونی هزری نێو موسـڵمانان، ئەگـەرهاتوو لـە زەینیانـدا چـالاك کـران و لـە عەقڵیانـدا چەسـپان ئـەو کاتـە لـە تێڕوانینیـان بـۆ کاروبارەکان وە بۆ چارەسـەری کتـوپڕی گرفتـەکان، وە لـە بڕیـاردانی چارەسـەرو حوکمەکاندا لەسەر بناغەیەکی هاوبەش لـەم پێـنج بنەمایـە، ئـەوکات ئەنجامـەکان یەك دەبن، یا بە لایـەنی کەمـەوە زۆر لێـك نزیـك دەبنـەوە، دوای ئەمـەش ویـستی کارکردن نزیکتر دەبن، عەقیدەی ئیسلامی بە مانا بەرفراوانەکـەی وەك ئـەوەی لـە

قورئانی پیرۆزو فەرموودەدا هاتووە دەبنە هۆی یەکخستنی هزری ئیسلامی لەسەر ئەم پێنج بنەمایە، بەڵام پێدەچێت کاریگەری مەنهەجی یەکبوون دیار نییە تەنها بەدیهاتنی مەرجی ئەکتیڤ و چالاك نەبێ لەوانە ئازادی رادەربڕین کەواتە چۆن ئازادی رادەربڕین، دەبێتە هۆکاری یەکبوونی هزری؟

## ١ـ ئازادیی رادەربڕین:

را، دەبڕێ بەسەر تێڕوانینی هزری لە پێناو مەعریفەتدا، هەروەکو چۆن دەبڕێ بەسەر ئەوەیدا عەقڵ پێی دەگات لە بیرورِا دوای تێروانین.

ئێمەش (را) لەم نووسینەدا بە هەردوو مانا بەکار دەبەین، هەوڵی هزر لە توێژینەوەی مەعریفیدا، وە بەروبوومی ئەو هەوڵە لە حوکمەکاندا.

ئەگەر بێتو (را) بەم مانایە ئیشێکی خودی بێ کە مرۆڤ پێی هەڵدەسێ لە نیوان خودو نەفسیدا، کە پاڵ بە هزرەوە دەنێ بۆ تێڕامان و توێژینەوە لە پێناو گەیشتن بۆ حوکمێکی مەعریفی، کەواتە مەبەست بە ئازادی رادەربڕین چییە؟ لە کاتێکدا مرۆڤ وا دەردەکەوێ لە رادانادا ئازادە بەبێ ئەوەی هیچ کەس ئەو مافەی لێ بستێنێ یا لێی زەوت بکات؟ وەڵامەکەی چمکی ئازادی رادەربڕین وەك ئەوەی بەکاری دەبەین، وە وەك ئەوەی بەربڵاوە لە بەکارهێنانە گشتییەکەیدا رەهەندی تاکی دەبەزێنێ لە پەیوەندی مرۆڤ بە نەفسی خۆیەوەو لە بنچینەدا رەهەندێکی کۆمەڵایەتی هەیە کە هەڵگری دوو رەگەزی گرنگە:

١ـ ئازادی مرۆڤ لە رێڕەوی تێڕوانینی هزری و هۆکارەکانی بەبێ ئەوەی لە لایەن کەسانی ترەوە دەرئەنجام و هۆکاری لە لایەن ئەوانی ترەوە بەسەردا بسەپێنرێ، کە پێدەچێت سەری بەرەو هەڵە راکێشێ، یان ناچاری بکات بە لەبەرگرتنی چەند رێبازێکی دیاریکراو کە پێدەچێت بیگەیەنێتە دەرئەنجامێکی پێش دیاریکراو، ئایا چاکو راست بێت یا پوچ، هەرکام لەوانە بێت بە یەکێ لە شێوازەکانی سەندنەوەی ئازادی رادەربڕین ئەژمار دەکرێ، چونکە ئەو تاکە دەستدەگرێ و دەیبات بۆ رایەکی دیاریکراو، کە پێدەچێت ئەو تاکە ئەگەر ئازادانە بیر بکاتەوە ناگاتە ئەو ئەنجامانە، بەڵکو بە تەواوەتی پێچەوانەی ئەو ئەنجامانەی دەست دەکەوێ، ئەم زەوتکردنەی ئازادی رادەربڕینە پەیڕەوو ئاکاری فیرعەونە لەگەڵ هاوشێوەکانی کاتێ دواکەوتوانی کۆدەکاتەوە تا رازییان بکات بە کوشتنی موسا پێغەمبەر، بەڵام پیاوێکی بڕوادار لەوێ دەبێت هەندێ راوبۆچوون

دەردەبڕێ کە هەڵەبوونی ئەو کارە دەردەخات، بەڵام فیرعەون ناوبڕێکی لێ وەردەگرێ بەزۆرەملێو روو لە دانیشتوانی دەوری دەکاتو دەڵێ: (قَالَ فِرْعَوْنُ مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ) (غافر: ٢٩) بەم دەرئەنجامە راستیەکانی پیاوە بڕوادارەکەیان لا ون دەکات، ناچاریان دەکات بۆ رازی بوون بەو دەرئەنجامانەی ئەم مەبەستیەتی بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامێکی خودی[1]، ئەم رێڕەوە فیرعەونیەش ئەورۆ زۆر بەدی دەکرێت بەتایبەت لە راگەیاندنە چەواشەکارەکاندا.

٢ـ ئازادی مرۆڤ لە دەربڕینی ئەو رایەی کە دوای توێژینەوەو لێکدانەوە پێی گەیشتووە، بڵاوکردنەوەی لە نێو خەڵکیداو بەرەنگاری لێکردنی و قایلکردنی خەڵکیش پێی، پێدەچێت ئەمە روکاری گرنگو گەورە بێت لە ئازادی رادەربڕیندا، ئەمەش مانا بەربڵاوە باوەکەیەتی، ئەبێ ئەو رایە چ بەهاو نرخێکی هەبێت لە خەیاڵو دیدی تاکدا خولیای بێت هیچ رۆڵێکی لە ژیاندا نەبێت و نەتوانرێ کۆمەڵگای پێ بژیو ئیشی لەسەر بکەن؟ وێڕای ئەمەش ئازادی مانای ئەوەیە بەرەو ناو خەڵك هەنگاو بنێو هەموو لەمپەرەکانی بەردەمی هەڵگرێو ئازادانە دەرببڕدرێ، یا شەپۆلەکانی بگاتە کەسانی تر، یا هەر پاڵپشتی بکرێو خەڵکی پێ قایل بکرێ، هەر کات هەر رێگرێ لەوانە هەبوو یا رێخۆشکردنی بۆ نەکرا، ئەوە مانای کۆتکردن و زەوتکردنی ئازادی رادەربڕینە.

پێدەچێت هەڵگرتنی ئاستەنگە خودیەکان کە دەبنە رێگر لە بەردەم هزردا بۆ تێڕوانینێکی بابەتیانە کە بە هەق بگات بە یەکێ لە کردنەوەی دەرگاکانی ئازادی رادەربڕین بێت، بەتایبەت ئاستەنگی ئارەزوو هەوەس، ئاستەنگی چاولێکەریو باوو نەریتی جێماو لە باووباپیرانەوە، ئەمانە هەموان ئاستەنگی بەردەم ئازادی تێڕوانینن کە هزر رێنمونی دەکەن بۆ ئەنجامێك وەك ئەوەی پێشتر پێشبینی کرابێت.

---

[1] بگەڕێوە بۆ ابن عاشور ـ التحرير والتنوير: ١٣٣/٢٤.

کاتێ ئازادی رادەربڕین بەمانای یەکەمو دووهەم لە چوارچێوەی بەرپرسێتی کۆمەڵایەتیدا کۆبکرێتەوە، بەم مانایە بەرپرسێتیەکی هاوبەشی کۆمەڵگاو تاکیە، چونکە کۆمەڵگا رۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە سەپاندنی کۆتو بەندی باوو نەریتو چاولێگەری لە سەر ئازادی رادەربڕین.

زۆر گرنگە ئەوە بزانین ئازادی رادەربڕین کورت هەڵناهێزێ لەسەر راوبۆچوونی تاکێك کە لە ئەنجامی تێڕوانینی خۆیەوە بە دەستی هێناوە، بەڵکو ئەو سنورانە دەبەزێنێ بۆ وەرگرتنی ئەو رایانەی کە مرۆڤ لە غەیری خۆیەوە وەری دەگرێ، ئەوەی بەرامبەر وەری دەگرێ راستی دەکاتەوە، دەیشیگەیەنێ بە خەڵکی تا قایلییان بکات لەسەری و لە ناویاندا بڵاوی دەکاتەوە، ئەمانە هەموو لە چوارچێوەی ئازادی رادەربڕیندا دەبینێتەوە.

گومانی تێدا نییە ئازادی رادەربڕین بێسەروبەری نییە، بەڵکو چەند بەندو رێسایەکی هەیە، وەك بەدواداچوونی دەرئەنجامەکان، ئەو رێڕەوانەی لەبەر دەگیرێن بۆ گەیشتن بە هەق، خۆیەکلاکردنەوە بۆ سودبەخش بوون و بەرژەوەندی گشتی، ئەگەر وانەبێ ئەوە شێوەیەکە لە ئاشوبو گێرەو کێشەو خۆپەرستی، هەروەها چەند بەندێکی ئەخلاقی وەك راستگۆ بوون لە رادەربڕینو گواستنەوەیدا، وە قایل کردنی بەرامبەر بە شێوازێکی جوان، ئەگەر وانەبێ ئەوە دەبێتە درۆو فێڵو خەڵەتاندنو خۆپەرستی، ئەگەر ئەو رێساو بەندانە رەچاو نەکەین ئەوە لەو چوارچێوەیەی کە لە بەکاربردنی گشتییدا دیاری کراوە دەچنە دەرەوە، ئەوەی ئێمە پشتی پێدەبەستین بریتیە لەو ئازادییەی کە دەکەوێتە ژێر ئەو رێساو یاسایەی بڕیاری لەسەر دراوە.

## ٢ـ بنەما شەرعییەکانی ئازادیی رادەربڕین:

ئیسلام هاتووەو ئازادی رادەربڕینی کردۆتە پیتۆڵـێ نـەك بـە شـێوازی مـافێکی موباح بۆ موسڵمان، بەڵکو لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەرکێکە لەسەری، لەبـەر زۆری هاتنی ئەو بابەتە، دەتوانین بڵێین لە پلـەکانی مەبەسـتە شـەرعییەکاندا (المقاصـد الشرعية) دەگاتە پلەی پێویستییەکان (الضروريات)، کەواتە مەبەستێکی پێویستە لە مەبەستەکانی شەریعەت.

سەرەتای نیگا هاتنی کۆمەڵە ئایـەتێ بـوون لـە سـورەتی (علـق)دا کـە بڕیـاری بنەمایەکی گرنگی عەقیدەی ئیسلامی پێیە وەك بوونی خوا، سـەرەتاو پاشـەڕۆژی بوون، لـە نێـو ئـەو ئایەتانەشـدا رێسایەك بـە دی دەکـرێ لـە ئـازادی رادەربڕینـدا ئەویش (أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى * عَبْداً إِذَا صَلَّى * أَرَأَيْتَ إِن كَـانَ عَلَـى الْهُـدَى * أَوْ أَمَـرَ بِـالتَّقْوَى (العلـق: ٩– ١٢) لــەم دەقــەدا سەرســوڕمانێکی ئــەرێی تێدایــە کــە سەرزەنشتو لۆمـەی تێدا دەخوێنرێتـەوە، وە نـەهی کـردن لـەوەی کـە دژایـەتی پێغەمبەر ﷺ دەکات لـە نوێـژ کـردن، ئەمـەش کۆتـە لەسـەر ئـازادی هەڵبـژاردنی بیرورا و بەندایەتی و نەهی لێدەکات لەوەی رێنمونی خەڵکی بە زۆر بکات بۆ ئاینی تازە، وە بانگیان بکـات بـۆ لـە خواترسـان کـە ئەمـەش دەبێتـە لەمپـەری ئـازادی گەیاندنی راو قایل پێکردنی[1]، ئەوە بەسە کە سـەرەتاکانی نیگـاو هـاتنی قورئـان ئاماژە بـە ئـازادی رادەربـڕین دەکـات[2]، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر پلـەو پایـەی لـە پیتۆڵی ئیسلامیدا.

لـە پــەیامی ئیـسلامیدا بڕیـار لــە سـەر ئــەوە دراوە کـە ئــازادی رادەربــڕین دەروازەیـەکی بایەخـدارە بـۆ ئیمـانی راسـتەقینە، بڕوابـوون بـە عەقیـدە نـا بێتـە

---

[1] بگەڕێوە البيضاوي ـ أنوار التنزيل ٧٤٦، ابن عاشور التحرير والتنوير ٣٠/ ٤٤٧.

[2] ئەم ئایەتانە لەگەڵ پێنج ئایەتی سەرەتای نیگادا دانەبەزین، بەڵام بە پێی بەهێزترین را یەکەمین ئایەتەکانێ بوون کە دوای وەستانی نیگا هاتنە خوارەوە، بگەڕێوە بۆ ابن عاشور ـ سەرچاوەی پێشوو ٣٠/ ٤٤٤.

ئیمانێکی تەواو لە تەرازوی ئایندا تا بینا کرێ لە سەر ئازادی فکری، کە بوار بەو کەسە دەدات تێڕامێ بەبێ هیچ کاریگەرییەکی بۆماوەیی‌و دەرەکی کە ببێتە پاڵنەر بۆ وەرگرتنی، یا رێنمونی کەسانی تر، ئەم تێڕامانە خودییەش دەبێتە هۆی بەرگرتنی قایل بوونێك کە بنیادنراوە لەسەر ئازادی تێڕوانین، لەبەرئەوە هەندێ لە زانایانی عەقیدە ئیمانی چاولێکەری بە ئیمان ئەژمار ناکەن، هەندێکی تریش بە ئیمانێکی ناتەواوی دەزانن[1]، ئەم رێسا دانانەی بە مانای سێیەمی ئازادی رادەربڕین کە پێشتر باسمان کرد، بریتییە لە رەهابوون‌و ئازادبوون لە کۆسپە خودییەکان‌و زۆرەملێ لەوانە بۆی ماوەتەوە.

ئەمەش بەسەر ئازادی رادەربڕیندا دەبڕێت کە مانای دەستەبەرکردنی کەش‌و هەواو رێ‌و شوێن‌و رێڕەوی جۆراو جۆر کە دەبنە هۆی دەستەبەرکردنی تێڕوانینێکی ئازادییانە، وەلادانی ئەو ئاستەنگانەی کە رێگرن لەم رێبازەدا، قورئانی پیرۆز یاسایەکی داڕشتووە کە دەستەبەرکردنی ئازادی‌و گەڕان بە دوایدا پێویست دەکات، لەو ئایەتانەش، خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا فَأُوْلَـئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءتْ مَصِيراً) (النساء: ٩٧) یەکێ لە ماناکانی ئەم ئایەتە پێویست بوونی سزایە بۆ ئەو کەسانەی رازین بە مانەوەیان لە (دار الكفر)داو ئەوەی لە خۆدەگرێ لە ئاستەنگ بۆ بیرکردنەوە لە رێکخستنی کاروبارەکانی ژیان لەسەر بنەماکانی ئیمان، وێڕای دەربڕینی رای خود لەوەدا، وەهەوڵیان نەداوە بۆ رزگاربوون لەم ئاستەنگانە بە کۆچکردن بۆ ئەو شوێنەی کە بارودۆخ گونجاوو لەبارەو بواری کراوەی تێدان بۆ ئازادی بیرکردنەوەو بەڕێوەبردنی کاروبارەکان.

---

[1] بۆ زانینی راوبۆچوونی زانایان لەمەڕ ئەم بابەتەوە بگەڕێوە بۆ البغدادي ـ أصول الدين ٢٥٤ اللقاني ـ شرح الجوهرة ٣٦.

قورئانی پیرۆز ئازادی رادەربڕینی ماناکردووە بە ئاشکراکردنو بڵاوکردنەوەی لە نێو خەڵکیداو گێڕوایەتی بە یەکێ لەو بنەمایانەی کۆمەڵناسی بۆ دروستکردنو بنیادنانی ئوممەت و پارێزگاری لێکردنی و پاراستنی یەکڕیزی و یەکبوونی، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَـئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (آل عمران: ١٠٤ـ ١٠٥). فەرمان کردن بە چاکەو رێگری لە خراپە ناواخنی ئازادی رادەربڕینە لەگەیاندنیداو بەڵگەهێنان لەسەری، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی روونکردۆتەوە کە لە کارخستنی ئەم ئازادیە یا خۆ بە دوورگرتن لێی دەبێتە هۆی لێکترازانی یەکڕیزی ئوممەتو پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ خوای خۆیدا، لەوەشدا دەفەرموێ: (لتأمرون بالمعروف ولتنهون عن المنكر أو ليسلطن الله شراركم على خياركم فيدعو خياركم فلا يستجاب لكم[1]) لە چوارچێوەی پراکتیزەو جێبەجێکردنیشدا ژیانی پێغەمبەر ﷺ پڕیەتی لە نموونەی زیندوو و جوان لە بواری ئازادی رادەربڕینو رەهابوونی هزر لە کۆتو زنجیرە خودیەکانو دەرەکییەکان کە سەر لە پووچو بەتاڵەوە دەردێنێ، لە پێناوکردنەوەی رێبازەکانی دەربڕینو قایلکردن، کتێبەکانی سیرەیش پڕن لە نموونە پڕ لە سەروەری لەو بوارەدا[2].

لە ئیسلامدا کاتێ بەرنامەی دارشتووە بۆ ئازادی رادەربڕین بێئاگا نەبووە لەو گەرەنتیانەی کە دەبنە ئاستەنگی کەچرەوبوونو سەردەرهێنان لە ونکردنی ئەو رۆڵەی بۆی دیاریکراوە، بەڵکو ئەم مافو ئەرکە کۆمەڵە رێنماییەکی بۆ دەرکراوە تا لە کەچرەوی بیپارێزێ، هەیانە مەنهەجییە وە پشکنینو بەدواداچوون بۆ دەرخستنی دەرئەنجامەکان، تێگەیشتن لێیو وێناکردنی راستەقینەی بەر لە

[1] أبو داود، الملاحم، ژمارە ٤٣٣٦.

[2] بۆ خوێندنوەی نموونەی زۆرتر بگەڕێوە بۆ محمد يوسف مصطفى، حرية الرأي في الاسلام ٦٨ بەدواوە، وە بگەڕێوە بۆ تاصيلاً شرعياً لحرية الراي بصفة عامة، ٤٤ لە دواوە.

بینادنانی هیچ رایەك لەسەریو بانگەشە بۆ کردنی لە نێو خەڵکیدا، ئەمەش لەم ئایەتە نومایشی دەکات (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ) (الحجرات: ٦) وە ئەم ئایەتەش (وَإِذَا جَاءهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ) (النساء: ٨٣) وە وێنەو نموونەی جوانترین شێواز لە قایلکردنو جوانکاری تێدا کردن، وەك ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکات (اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى * فَقُولَا لَهُ قَوْلاً لَّيِّناً لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى) (طه: ٤٣ـ ٤٤).

هەشیانە ئاکارو رەوشتییە، وەك ئازارنەدانی و بریندارنەکردنی کەسانی تر، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (النور: ٢٣) و وەك خۆ بە دوورگرتن لە زیادەڕەوی کردن لە پێدا هەڵدانا کە زۆرجار بە دووڕوویيو دەغەڵی تەواو دەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی فەرموو کاتێ بە پیاوێکی تریدا هەڵدا: (ويلك قطعت عنق صاحبك مراراً) پاشان فەرمووی: (من منكم مادحاً اخاه لا محالة فليقل: احسب فلاناً والله حسيبه، ولا ازكى على الله احدا، احسبه كذا وكذا ان كان يعلم ذلك فيه)[1]. لەوەی رابوورد روون دەبێتەوە کە ئیسلام کاتێ ئازادی رادەربڕین وەك ئەرکو مافێك بڕیار دەدات مەبەستی سەرەکی ئەو گەرەنتیانەی پێی دەبەخشێ بنەمایەکە کە گەورەترین مەبەستەکانی پاراستنی یەکڕیزی ئوممەتی ئیسلامییە بە گشتی، لەوانەش یەکبوونی هزری، بۆ ئەوەی ئازادی رادەربڕین بتوانێ یەکڕیزی هزری نێوان موسڵمانان بپارێزێ دەبێت هەڵگری ئەو پێنج ئاکارە مەنهەجییانە بێت کە پێشتر باسمان کردن و کردنمان رایەڵو بنەمای یەکبوونی هزری، کەواتە چۆن ئازادی رادەربڕین دەتوانێت یەك بە یەکی ئەو رایەڵانە بێنێتە دی تا بە یەکبوونی هزری موسڵمانان بگەین؟ لەمە بەدوا

---

[1] البخاری، کتاب الشهادات ـ با إذا زکی رجل رجالاً، بۆ باسی ئەم گەرەنتیانە بگەڕێوە بۆ سەرچاوەی پێشوو ٣٩و ١٣٢ بە دواوە.

دەمانەوێت وەڵامی ئەو پرسیارە روون بکەینـەوە، ئـەویش بـە بەلەبەرچـاو گرتنـی رێبازێـك لــە دوو رەگــەزەوە، یەکــەمیان، روونکردنەوەیــەکی بیردۆزەیــی، ئــەوە دەسەلمێنیَ کە کاتـیَ ئـازادی رادەربـڕین وەك ریَو شـوێنێك پیـادەکراو لـە نێـوان موسـڵمانانـدا دەبێتــە هــۆی پــەروەردە کردنــی عــەقڵ لەســەر ئــەو ســیفەتە مەنهەجییانــەی کــە رایــەڵێکن لــە رایەڵــەکانی یــەکبوونی هــزری، دووهەمیــشیان سەلماندنی ئەوانە بە نموونەی زیندووی مێژووی ئیسلامی یا ژیانی ئەمرۆ.

## ٣- ئازادیی رادەربڕین و شمولیەت لە تێڕوانیندا:

ئـازادی رادەربـڕین لـە هـەردوو رەهەنـدی تـاکیو کۆمەڵایەتیـدا دەبێتـە هـۆی دروسـتبونی سـیفاتێك لـە گـشتگیریو دروسـت بـوونی تێڕوانینێکـی مـەعریفی بـۆ هەموو بەشەکانی مەعریفەت، وە لـە گـشتگیری کۆکردنـەوەی دەرئەنجامـەکان لـە کاتی کێشەو کارەساتو گێروگفتو کێشەیەکی دیاریکراودا کە عەقڵ مەبەستیەتی بە حەقیقەت بگات.

کاتـیَ مـرۆڤ ئـازاد دەبێـت لـە کۆتـە خودییـەکان کـە جڵـەوی عـەقڵ دەگـرن و دەیبــەن بــۆ بەدەســتهێنانی دەرئــەنجامێکی پێــشوەخت وەك ئەوانــەی زادەی چاولێکەری و باوو نەریتین، یا وەك زەبرو هێزی هەواو هەوەس، وەر هـەر کـاتیش رەهابوو لە کۆتوبەندی کاریگەری دەرەکی کە دەبنە هـۆی سـەپاندنی ئـەنجامێکی دیـاریکراو، یـا شـێوازێکی دیـاریکراو لـە توێژینـەوە، ئـەوەش دەبێتـە خـاڵێکی دەستپێکی بێسنوور کۆمەڵە ئـەنجامێکی دەسـت دەخـات کـە پێدەچـێت بتوانێـت ریبازی راستیان بۆ روونـاك بکاتـەوە، کۆمەڵـە رێبـازو شـێوازێك دەگرێتـە بـەر کـە پێدەچـێت بیگەیێنێتــە زانـست، وە مێـشکی بکاتـەوە کاتـیَ روو دەنـیَ لـە چـەند رێرەوێکی جیاواز بۆ بەدەستهێنانی مادەی گونجاو بۆ توێژینەوە و شاهێدی ئەوتۆ کە بیگەیەنیَ بە حوکمدانێکی راستو رێـك ، هـەروەها کاتـیَ بـواری دەربڕینـی راو گەیاندنی بەرگری لێکردنی بکرێتەوە، دەبێتە هۆی دروستبوونی کەشـێکی گونجـاو

بۆ پەیڤین کە راکان بەرامبەر یەك دەبنەوە، بەڵگەکان دەکەونە کێشمەکێش ئەو دەم چەندین دەرئەنجام و رێبازی نوێ دێنە گۆڕێ کە لە ژێر پەردەی غەفڵەتدا متکرابوون یا بە هەر هۆیەکەوە پەردەپۆش کرابوون، ئەو دەمە کۆمەڵە شتانێك دەست دەکەون و عەقڵ پەی بە شتێ دەبات کە پێشتر لای نەبووە، یان مەکۆی تێڕوانین و زانیارییەکانی بەمانە دەوڵەمەند دەکات، یا پێدەچێت ببێتە هۆکاری راستکردنەوە لەدەرئەنجامی توێژینەوەدا، پێدەچێت بگاتە حوکمێکی نوێ.

وێڕای ئەوانەش، هزر پەروەردە دەبێ لەسەر گشتگیری لە هەوڵدانی مەعریفیدا، لەیەك رێبازدا کۆمەڵە هۆکارێك یەکدەگرن بۆ گەشتن بە هەقیقەت، لە چەند رێچکەو رێبازێکی هاوسان یا وەك یەك کە بە یەك ئەنجام دەگەن، لە بەرامبەر هەموو ئەوانەوە سنووردارکردنی ئازادی لەهەر کام لەو سێ ئاستەدا، دەبێتە هۆی کورت هەڵهێنان لەئازادی هزردا لە شێوازێکی دیاریکراودا و تەنها یەك ئامانج بەدەست دێنێ وە تەنها بەرەو یەك لایەنی تاك رێنموونی دەکات، ئەو دەمە خو دەگرێ بە تاکڕەوی لە تێڕوانیندا، دەرئەنجامەکانیش زۆر جیاواز دەبن، پاشان هەرکات ئازادی رادەربڕین لەکار خرا بەڵگەکانیش پشتگوی خران، هزر لەسەر تاکڕەوی و تاك لایەنی ئۆقرە دەگرێ، کە ئەنجامەکەشی داخران دەبێت، ئەوکاتیش هەلەکانی راستکردنەوەو گۆڕین لەنێو دەچن، ئەمەش دەبێتە هۆی پەرتەوازە بوون و بەرامبەر یەك وەستان.

پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی لەسەر ئازادی رادەربڕین پەروەردە دەکرد، رێنمونی دەکردن تا ئاکارێکیان تێدا دروست بکات کە بیناکرا بێت لەسەر تێرامانێکی گشتگیرانە لەچارەسەرکردنی کێشەکاندا، کە رایان بکێشێ بۆ یەکبوون لە بڕیاردانـدا، زۆر جار هاوەڵانی کۆدەکردەوە بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکان، داوای راو بۆچوونی لێدەکردن، زۆریش پێداگری دەکرد لە کۆکردنەوەی زۆرترین دەرئەنجامی بەسوودو رێ چارەی زۆری وەردەگرت، تا دواجار رای راستترینی پەسەند دەکردو هەموانی لەسەر کۆدەکردەوە، دیارترین نموونە لەسەر

ئەوە ئەو راوێـژە بەرفراوانـە بـوو کـە پێغەمبـەر ﷺ بـە هـاوەڵانی کـرد پـێش لـە دەسـتپێکردنی غـەزای بـەدر، سـەبارەت بـە هەڵوێـستی هـاوەڵان بەرامبـەر ئـەو شـێوازەی کـە دەبێـت لەبـەر بگـیرێ بـۆ رووبەڕووبوونـەوەی قـوڕەیش کـە نیـازی جەنگیان هەیە، پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی کۆکردەوە وتووێژێکی زۆری لەسەر کرا تا بۆ دواجار بڕیاری شەڕ درا[1]، پێم وایە ئەم هەڵوێستە راوێژکارییەی پێغەمبـەر ﷺ تـەنها مەبەسـتی پـەروەردەکردنی موسـڵمانان بـوو لەسـەر ئـازادی رادەربـڕین بـۆ راهاتن لەسەر تێڕامانی گشتگیرانە، چونکە (وەك هەموان دەزانـین) پێغەمبـەر ﷺ لە رێـی نیگـاوە رێنمـوونی کـراوە و دەکـرێ بـۆ راسـترین هەڵوێـست و راسـترین راوبۆچـوون، لـە مەیـدانی کـاری ئیسلامیـشدا، لەسـەدەکانی سـەرەتادا ئـازادی رادەربڕین زۆر باوو بەربڵاو بوو، ئەوەش شایەتی لەسـەر ئەمـە دەدات ئـەو هـەموو ئـاینزا فقهیـەو بۆچـوونانەی بـواری عەقیـدەن، هـەروەها لەهـەر سەدەیەکیـشدا ئۆپۆزسیۆن هەبووەو رۆڵی خۆی بینیوە.

ئـەو پەرتـەوازە و پـچڕانەش کـە لـەو گرووپـە سیاسـییانەوە بەتایبـەت بـەدی دەکرێ هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ رەچاونەکردنو شـێواندنی بنـەماکانی ئـازادی رادەربڕین نەك خودی رادەربڕینەکە، ئەم ئازادیە بەشێوەیەکی گشتی لە عەقڵیەتی ئیسلامیدا تایبەتمەندییەکی مەنهەجی بەدی هێنا لە گشتگیری تێڕوانینی مـەعریفی کە زۆر نایابەو دەگمەنیش هاوشێوەی بەدی بکرێ لەناو کـەلتورەکانی دنیـادا، بـۆ راست بینینی ئەمەش سەیر بکە کە هەموو مەعریفەتە مرۆییە دەستەبەرکراوەکانی ئەو دەمە عەقڵی ئیسلامی وای لێکردنو گەیاندیە چـەند دەرەنجامێـك کـە هانـدەر بوون لە پێناو گەیشتن بە حەقیقەت، بەبێ وەلا نانی هـیچ رەگـەزێکیان، هـەروەها سەیر بکە کە چۆن ئەم عەقڵـە کرانـەوەی بـە خـۆوە بینـی لەسـەر هـەموو بەڵگـەو

[1] بۆ شیکاری ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ محمد یوسف مصطفى، حرية الرأي ٧٠ دواتر، بۆ زانینی گفتوگۆکەش بگەڕێوە بۆ ابن هشام ـ السيرة النبوية ٣٠٥/١ دواتر.

سەلماندنانەی کە هاوردە بوون لە بزاڤێکی پەیڤینی بەرفراواندا، کە موسڵمانو ناموسڵمانانیشی گرتەوە بەبێ نەرێ دەربڕینی مەبدەئی بەرامبەر هیچکامیان، بەمەش سەرمایەیەکی گەورەی بێ سنووری چاکی لێکەوتەوە.

وێڕای ئەوەی کە جاروبار هەندی شتی نەخوازراو روویان دەدا لەو کەشو هەوا گشتییە بارگاوی کراوە بە ئازادی، سیفەتی گشتگیری لە تێڕوانینی مەعریفی شێوەیەك لەیەك بوونی هزری لە نێوان موسڵماناندا دروست کرد، رێخۆشکەر دەبوو بۆ پابەندبوونی ئاینی کە مۆرکی کەلتوری ئیسلامی پێوە نرابوو، هەر لە سەرەتاوە لە هەموو زانستە ئیسلامییەکاندا بە گشتی تەنانەت زانستە گەردوونییەکانیش بەمەشەوە نەوەستا گەشتە دەستکەوتە ئاوەدانییەکانیش وەك شاروو خانووبەرە... هتد، هەروەها یەکێ لە سیما دیارەکانی تری بەرەنگاری کردنو دژوەستانی ئەو شتانە بوو کە دژی بەها بەرزو باڵاکانی ئیسلام بوون لە کاریگەری ئاینەکانەوە تا کەلتوور رۆشنبیرییە کۆنەکان بە بەرنگارییەکی گشتگیرانەی بەهێز کە ئیمامی غەزالی بە جوانترین دەربڕین لە باسی هەڵوەشاندنەوەی فکری یۆنانیدا دەری دەبڕێ و دەنوێنێ (من ناچمە ناو بواری رەخنەگرتن لێیان، تەنها وەك چوونە ناو کەسێکی نەیار نەبێ نەك کەسێکی دادخوازی تابت گەر، ئەوەی ئەوان بڕوایان پێیەتی من پوچەڵی دەکەمەوە بە چەند راوبۆچوونێکی جیاوازەوەوە، (لەناویان دەدەم) بەراوبۆچوونی موعتەزیلە، جارێکی تر راوبۆچوونی کەرامیە، وە جارێکی تریش بە راوبۆچوونی واقفیە، نەهاتووم بۆ ئەوەی بەرەنگاری لە ئاینزایەکی تایبەت بکەم، بەڵکو هەموویان وەك یەك سەیر دەکەم، گرووپو تاقمو دەستەکانی تر پێدەچێت لە زۆر شتدا یەك نەگرنو پێچەوانە بن، ئەوان لە رایەڵەکانی ئاین دەدەم، با هەموان یەك دەست بن دژیان، لە کاتی نارەحەتیو سەختیدا دووبەرەکییەکان و دژایەتییەکان هەڵدەگیرێنو وەلادەنرێن)[1]، ئەم یەکبوونە هزرییەی ئیمامی غەزالی باسی دەکات

[1] الغزالي، تهافت الفلاسفة ٨٢ـ ٨٣.

لــە رووی ئــەویتردا کرانەوەیــەکی تێــدا بێــت لــە بۆچــوونو بــیروڕاو بەڵگــەو سەلماندنەکاندا.

ئەمەش یەکێکە لـە هۆکارەکـانی یەکخستنی دیدوبۆچـوونو هەڵوێـستەکان لـە بۆچوونی غەزالیدا لەم بوارەدا.

بە تێڕامانێکی باش لە هزری موسـڵمانان ئـەوە بـەدی دەکـرێ هـەرکات لەهـەر زەمان و کاتێکدا ئازادی رادەربڕین خنکێنرابێت یا لـەناو گـرووپو تاقمێکـدا ئـەوە رووی دا بێت، بۆتە هۆی بەرتـەسك بوونەوە، لە مەیدانی بەدەستهێنراوەکانداو ئـەو رێبازانەی کە مەعاریفی ئیسلامیی و حوکمەکانی لەسەر بنیاد نراوە، ئـەو دەمـەش عەقڵیەتی لاوەکـی لـە دایك دەبێـت، ئەمـەش رێخۆشـکەر دەبێـت بـۆ پەرتـەوازەو دەســتە دەســتە بــوون، بــا نموونەیــەك وەربگــرین لــەوەدا، دیمــەنی خنکانــدنی ئیجتیهادی فیقهی لە سەدەکانی دواکەوتندا، ئەمەش بوویە هۆی کـورت هـەڵهێنانی زانایان لەسەر وتەی زانایـانی پـێش خۆیـان و دوورکەوتنـەوە لـەو بگـرە وبـەردەو کێـشانەی کــە لــە واقیعــی موســڵماناندا روویــان دەدا، نــەك هــەر ئەمــە، بــەڵکو دوورکەوتنەوەیــەك لــە قورئــانو ســوننەتیش دروســت بــووە، ئــەو کــات فیقـهو پەرتــەوازە بــوون بوویــە چــەند رایــەکی لاوەکــی، چارەســەرە گریمانەییــەکان بــە دەگمەن سودبەخش دەبن لە رێنمونی کردنی ژیانی موسڵمانان بەرەو یەك رووگـەو بنیادنــانی شارســتانیەتێکی یــەکبوو، نموونەیــەکی تــر وەربگــرین، لــە دیــاردەی تەصــەوفیێ زیــادەڕەوی تێـدا کـراوە کـە هــەڵگرانی روویــان لــە دونیــای دەروونو رووحــانی بــوو، کــە تێیــدا هــۆگر بــوون بــەو تــەی پێــشرەوو پێــشەواکانیان و هەڵوێستەکانیان و خۆشـیان ئازادییـان لـێ زەوت کرابـوو، هـیچ کـات روویـان لـەو دەرئەنجامانــە نــەدەنا کــە زادەی واقیــعو ژیــانی گــشتی بــوون وە بــۆ ئــەزموونی کەسانی ترو راوبۆچـوونی عـەقڵی ئـەوانی تـر، حوکمدانـەکانیان خـودی و لاوەکـی بوون، نـەدەکرا ببنـە رێگایـەگی گـشتی، بـەو شـێوەیە هـەرکات تـەنگ بـە ئـازادی رادەبـــڕین هەڵبـــچنرێ بزاوتنـــی هـــزریش دەکەوێتـــە تەنگەبەرییەکـــەوە،

دەرەنجامەکەشی ڕێسایەکی لاوەکی دەبێت کە شیاوی ڕێنمونیکردنی ژیانی گشتی نابن.

## ٤ـ ئازادیی ڕادەربڕین و مەنهەجییەتی یەکتاپەرستیی:

ئازادی ڕادەربـڕین ئـەو کەشـە لـە بـارو گونجاوەیـە کـە هـزری تێـدا پـەروەردە دەکرێ لەسەر ئاکاری یەکبوونو پێکـەوە ژیـان، لـە دیدوبۆچـوونی مەعریفییـەوە، چونکە ئازادکردنی هزر لەو کۆتایانەی کە بەسەریدا سەپێنراوە لە خودی مرۆڤـەوە یا لە دەرەوە گۆڕانو گواستنەوەی بۆ ئازاد دەبێت لە ماوەی تێڕوانینی لەمەوە بۆ ئـەوەی بەرامبـەری، لـە وێنەکـەوە بـۆ هاوشـێوەکەی، لـە بزاڤێکـی بـەربڵاودا، کـە ئەنجامەکەشی هەست کردنە بە هۆکاری هاوبـەش بـۆ لێکـچوونو وەك یـەك بـوون، ئەو کاتەش هاوئاهەنگ بوون و یەکبوون لە نێوانیاندا لـە شـیکردنەوەو ڕاڤەکردنـدا دروست دەبێت، لەوەشەوە ئاکارو هۆگری تێدا دروست دەبێت، کە دەست دەگـرێ بـۆ هـۆکـاری ڕاستین، کە زۆرێك لە دیـاردەکان ڕاڤــە دەکـات، ئــەو دەمــەش ڕاو بـۆچـوونەکان ئـاراستە دەکــات بـۆ دەسـتەبەر کـردنی بـە مەبەستی یـەکـبوون.

بەڵام هەرکات هزر ئارەزوو باوو نـەریت ڕێنمـونی گـەری بێـت، یـا هـزر بابـەتو ئەنجامی پێش دیاری کراوی بەسەردا بـسەپێنرێ بـۆ ئـەوەی بگاتـە ئـەنجامێك کـە پێشتر بۆی دیاری کراوە ئـەو دەمـە جڵـەوی لـە دەسـتی ئـەوەدا دەبێـت کـە ڕێـی نیشان دەدا، هیچ هۆیەك نابینێ تەنها ئەوە نەبێ لەوەوە نزیکـەو لـە چوارچـێوەی ئـەو مەبەسـتانەی کـە بـۆی دەستنیـشان کـراوە تـەنها ئـەو مەبەسـتو ئامانجانـە دەبینـێ کـە گونجـاون لەگەڵیـدا، ئەوکاتـەش هـەنگاوەکانی لەسـەر ئـەو بۆچـوونە دەنێت، وەك ئەوەی کە ڕەگێ بێ لەو پەلی کێشاوەو ئاگـاداری هـیچ پەیوەندییـەك نییەو ناتوانێ ئاراستەی بکات بۆ مەبەستانێکی هاوبـەش، بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئـەم مەبەستەش دوو نموونە باس دەکەین:

١ـ له قورئانی پیرۆزدا وێنای عەقڵیەتی هۆزەکەی فیرعەون کراوە، کە فیرعەون و جادوگـەرەکانی ئازادیـان لـێ زەوت کردبـوون، وە رێنموونیـان دەکـردن بـۆ ئـەو رێبـازەی کـە خزمـەتی ئـەو پەروەردگارییەتـەی دەکـرد کـە فیرعـەون بانگەشـەی دەکرد بۆ خۆی، نەیانهێشت بیر له هیچ ئـەنجامێکی تـر بکەنـەوە پێـچەوانەی ئـەو بۆچوونەی تر بێت ئەمەش بویە هۆکاری دروستبوونی ئەو عەقڵەیەتە لەسەر چـەند رایـی سـەبارەت بـە راڤـەکردنی رووداوەکـان، وەکـو کـورت هێنـان لـە یەکخستن‌و هۆگری بۆ گەشتن بە هۆکـانی راسـتی یـەکبوون، ئەمـەش وا باسـی دەکـات (وَلَقَـدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَونَ بِالسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّن الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ * فَـإِذَا جَـاءتْهُمُ الْحَـسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَـذِهِ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَى وَمَن مَّعَهُ أَلا إِنَّمَا طَـائِرُهُمْ عِنـدَ اللّـهُ وَلَــكِنَّ أَكْثَـرَهُمْ لاَ يَعْلَمُـونَ) (الأعـراف: ١٣٠ــ ١٣١). ئـالی فیرعـەون راڤـەی دیـاردە سروشـتییەکانی وەك وشـکە سـاڵی‌و خۆشـگوزەرانی بـە عەقڵیـەتی پەرتـەوازەیان دەکرد، خۆشگوزەرانییان دەگەڕاندەوە بۆ ئـەو کردارانـەی ئـەنجامیان دەدەن، وە وشکە ساڵی‌و نەهامەتییەکانیشیان دەخستە ئەستۆی موسا پێغەمبەرو هـاوەڵانی‌و ئاینەکەیان، ئیبنو عاشور سەبارەت بەمە دەنووسێ (وایان دەزانی بوونی ئـاینێکی پێچەوانەی ئاینەکەیان هـۆی تووشـبوونیانە بـە موسـیبەت‌و ئـەو زیانیانـەی لێیـان دەکـەوێ، نەیانـدەزانی هـۆی ئـەو موسـیبەتانەیان پـشت هەڵکردنیانـە لـە ئـایین ئەمەش کوێربوونەلە ژیانی گومڕاییدا، بەمەش هەردەم دوور دەکەونەوە لە ناسین‌و زانینی هۆکـاری راسـتین، لەبەرئـەوە نوقڵانـە لێـدان دروشمـی ئـەهلی شـیرك بـوو، چـونکە بینـا کرابـوو لەسـەر پاڵـدانی ناراسـتی هۆکارەکـانی بـۆ لای ئـەو ئەسـبابە درۆینانــە، ئەمــەش لــە داهێنراوەکــانی ئــەو نــەبوو کــە ئــەو ئایینــە شــیرکەو خەیاڵاتییەیان بۆ دانابوو)[1].

٢ـ ئـەوەی دەبیینـین لـەو ئاراسـتەکردنی کـە لـە راگەیانـدنی رۆژئـاوادا یـە کـە دەستی گرتووە بەسەر ناوەندەکانی دەسەڵاتی زلهێزەکاندا، ئەم ناوەندانـە لـە رێ

---

[1] ابن عاشور ـ التحرير والتنوير ـ ٩/ ٦٦.

ئاژانسە هەواڵیەکانیانەوە بابەتێکی راگەیەنراو دەسەپێنێ بەسەریدا لەو رووداوە ئەقلیمیو جیهانیانە و ئاراستەیان دەکات بە ئاراستەیەکی تایبەت وای بە گوێی بیسەردا دەدات کە هەرێمێکی سەربەخۆیە.

بەم سنووردارىو ئاراستەکردنە لە بابەتێکی راگەیاندنیدا کە دەستی بەسەر جیهاندا گرتووە، عەقڵی هەموان ئاراستە دەکات بۆ شیکردنەوەی رووداوەکان و پێگەیشتنیان لەسەر ئەو بۆچوونەی کە هۆکارو ئەو دەستانەی لە پشتەوەی ئەون، هۆکاری ئیقلیمیو هەرکام بە پێی خۆی شیکردنەوەی بۆ دەکرێت، چاو لە ئاستی هەر شتێکدا دەنوقێنێ کە پەیوەندی بەوەوە هەیە بۆئەوەی بگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە یەك هۆکار هەیە کە خۆی لە دەسەڵاتی زلهێزە نێودەڵەتییەکاندا دەبینێتەوە، کە سەرچاوەی دروستبوونی روداوە جیهانییەکانو ئاراستەیان دەکەن بەشێوەیەك لەبەرژەوەندی ئەوان بێت لە زۆربەی شوێنە ئیقلیمیەکاندا.

ئەم عەقڵیەتەش مۆدێلی رۆژە لە نێوان خەڵکیدا بە گشتی، بە هۆی نەهێشتنی سەربەخۆیی و ئازادی کە دەرئەنجامێکی نابێت تەنها بە ورونکردنەوەی ئامانجەکان نەبێت بەو مەرجەی ئاراستە نەکرابێ.

بەهەمان شێوە ئازادی رادەربڕین لە ئاستی راگەیاندنو بەڵگەهێنانەوە هەرکات لەناو خەڵکیدا ئازادیەك چرۆ بکات بۆ پەیڤین کە راکان دەکەونە زۆرانبازی بەڵگەکانیش چالاك دەبن، ئەمەش کۆمەڵە پێوەرو پێوانەیەکی یەکبوو دەسەپێنێ کە ئەو کەسانەی مشتومڕیانە پەنایان بۆ دەبەن بۆ داوەری.

ئەو کات هزرەکان یەك پێوەریان دەبێت لە خوێندنەوەی رووداوەکاندا، بەڵام هەرکات هزرەکان داخرانو لە خودی خۆیاندا ماخۆلانیان بوو تەنها راوبۆچوونی خۆیانیان بینی، ئەوکات لەسەر پێوەری خودی پەروەردە دەکرێن، دەرئەنجامەکەشی ئەوە دەبێت رێپێوانی توێژینەوەی کورت پڕ دەبێتو هیچ پێوەرێکی یەکبوونی نییە لە توێژینەوەو رێنمونی کردندا.

پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی پەروەردە دەکرد لەسەر ئازادی رادەربڕین لە هەموو ئاستە جیاجیاکاندا، ئەمەش هێزی دروست دەکرد لەسەر یەکبوون‌و هاودەنگ بوون لە راڤەی رووداوەکاندا و لەسەر جێگیرکردنی ئەو حوکمانەی کە ژیانیان لەسەر بنیاد نا بەو فراوانیەی تا رووگەیەکی یەکبوونیان هەبێت بەرەو لای خوای گەورەیان ببات، بەم عەقڵیەتەوە قورئان کۆکرایەوە بە چەند قۆناغێك کە ئەنجامەکەی کۆکردنەوەی هەموان بوو لەسەریەك موسحەف ئەویش موسحەفی (ئیمامی عوسمان) بوو، کرایە تەنها موسحەف بۆ موسڵمانان، بە هەمان شێوەش لە سەردەمی ئیمامی عومەردا بەردی بناغەی رژێمی ئیداری ئیسلامیان دانا، کە بوویە هۆی یەکبوونی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات بۆ خزمەتکردنی ئومەت بە پێوەری ئاین، هەمان رێڕەویان لەبەر دەگرت لە هەموو کاروبارەکاندا.

لەسەر ئەم شێوازە عەقڵیەتی ئوممەتی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی بنیاد نراوە، ئەویش عەقڵیەتێکی یەکگرتوو بوو لە پەیڕەودا، هەروەکو چۆن لە عەقیدەو بڕوادا یەکبوو بوو، بواری ئازادی رادەربڕینیان بۆ رەخسابوو وەك ئەوەی کە لە چاخی یەکەمدا باوبوو، بەتایبەت دەستەبەرکردنی بەشێوەیەکی بەرفراوان، هێڵی پەیڤینی ناوخۆ لە نێوان گروپو ئاینرا ئیسلامییە جیاکاندا، دەرەکیش لەگەڵ کەلتوورو ئاینە جیاوازەکاندا، ئەوەش بوویە هۆی دارشتنی هزری موسڵمان بەشێوەیەکی گشتی لەسەر شێوازی هەنگاونان‌و گەشتن بەو هۆکارە هاوبەشانەی دیاردە جیاوازەکان‌و دروستکردنی هۆگری لە نێوان بەدەست هێنراوە فکری پراکتیکییانەدا بۆ ئاراستەکردنیان بەرەو خزمەتکردنی ئاین، ئەمەش تاکە مەبەستو ئامانجمانە، ئەمەش بە جوانی دیارە لە بوارە زانستییەکاندا، بۆ نموونە لە داهێنانی ئەو زانستە فراوانەدا دیارە کە شێوازی یاساییان بە خۆیانەوە گرتووە کە زانستی (أصول الفقه) و زانستی رەخنەی ئەدەبی و کۆمەڵناسی خەلدونی.

هەرچەند تەنگ بە بواری ئازادی رادەربڕین هەڵچنرابێ لە قۆناغێ لە قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامیدا ئەم تایبەتمەندییەش هاتنەوەیەکی بەخۆوە بینیوە لە چاخی

ئیسلامی یەکەمدا کاتێ ئازادی رادەربڕین لە نێو کۆمەڵگای ئیسلامی فراوان بوو تایبەتمەندی یەکبوونو یەکڕیزی زۆر روون دیارو نومایان بوو.

دوای سەدەی پێنجەم کاتێ دیکتاتۆری سیاسی باڵی کێشا بەسەر زۆرێ لە دەوڵەتۆکە پەرتەوازەکاندا، کە لەگەڵ ئەمەشدا مراندنی فکری بە داخستنی دەرگای کۆشین (اجتهاد) بوویە رێورەسمی کارپێکراو، بیروبۆچوونی سۆفیگەری بڵاوبوویەوە، تایبەتمەندی یەکبوونو بەکڕیزی دارمانێکی بەخۆوە دەبینی، دەبینین زۆرێك لە زانایان خۆیان خەریك دەکرد بە شتە لاوەکییەکانی بواری زانستو مەعریفەوە، بەبێ رێکخستنێکی گشتگیرو یەکبوو، وەك ئەوەی لە چاخی یەکەمدا ئیشی بۆ دەکرا لە بواری زانستدا، وەك بە روونی لە زانستی فیقهدات دیارە، لە سەردەمانی راڤەکردنیو پەراوێزنووسیندا، کە لە سەرەتادا دەهاتن ژیانیان بەبۆیەیەکی ئیسلامی یەکبوو روو لە خوا رەنگ دەکرد، وەك ئەوەی لەو زانستی (کلام)داو لە دەورانی ئازایەتیو پەیڤین دا دیارە کە بەرلەوەی دەست بداتە مەعریفە مرۆییە گشتییەکانو ئیسلامیانە دایانرێژن لە بەڵگەهێنانەوەیەکی یەکبوودا بۆ سابت کردنی بیرورا، لادانی پەردەی گومان لە سەری، وەك ئەو وەسفە جوانەی خاوەنی (مفتاح السعادة) دەیکات، کاتێ ئەوە روون دەکاتەوە کە بابەتی زانستی عەقیدە بە فراوان بوونی بوارەکانی تری زانست بەرفراوان دەبێت، وە هەرچەند موسڵمانان زانستی نوێ بناسن مادەیەکی نوێی لێوەردەگرنو ئاوێتەی دەکەن لەگەڵ زانستی عەقیدەو بەکاری دەبەن بۆ بەڵگەهێنانەوە[1].

## ٥ـ ئازادیی رادەربڕین و واقعییبوون:

واقع دیاردەیەکی بوونو بەرهەستە، ئەو رووداوانەی دێنو دەچن نزیکترینن بۆ زەینی مرۆڤ، وەك خاڵی سەرەتا بۆ بزاڤی مەعریفی، ئەگەر هزر رەها بکرێو

[1] بگەڕێوە بۆ ـ مفتاح دار السعادة ـ طاش کبری زادە.

بدرێته دەست خوارسکی خۆی ئۆتۆماتیکی ئاراستەی دەکات بۆ واقعی سروشتو ژیانو تێڕامان لێی، هەروەها خۆنەویستانە ئاراستەی دەکات بۆ رێککەوتن لەگەڵ ئەوانەی بەرامبەری و پەیڤین لەگەڵیاندا سەبارەت بەو شتە هاوبەشانەی ژیان دێنە سەر رێیان، تایبەتمەندی واقعیەت لە تێڕاماندا ئەنجامەکەی دەبێتە ئازادی لە رادەربڕیندا کە یەکێکە لە خواستەکانی خۆرسکی، ئەمەش دەکرێ بێتە رێڕوونیەك سەبارەت بە شیکاری ئەوەی کە چۆن گوندنشین و خێوەتنشینەکان کاتێ رەهان لەو کۆتو بەندەی کە شارنشینی دەیخوازێ و دەیسەپێنێ و لەو تێك ئالآن و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ئالۆزە، کە چۆن ئەوان زیاتر بە ویژدانن لە خەڵکی شارنشین، راستێتی ئەمەش زۆر بە روونی دیارە لە واقعیەتی عەرەبدا، کاتێ کە ئیسلام هات لە کاتیکدا زۆربەی ئەوان بیابانگەروو دەوارنیشن بوون، لەبەرامبەر فکری یۆنانی و فارسیو هندی نغرۆ لە فەلسەفەی وشكو سۆفیگەریدا خۆگربوونو نەگۆڕابوون.

کاتێ ئازادی هزر رووبەڕووی کۆتو بەندی جیاواز دەبێ، ئەو دەم عەقڵ واقعیەتی خۆی ون دەکاتو رووداوەکاتە خۆبەرزتر زانین لە واقع، وە داڕشتنی راوبۆچوونو حوکمەکانی لەسەر بنەمایەکی دوو ر لە واقع، ئەمەش دەبێتە هۆی ون کردنی ئازادی لە رادەربڕیندا، لە تێڕوانینی مەعریفی و دەربڕینو بەڵگەهێنانەوە و دوورکەوتنەوە لە واقعیەت بۆ هەودایەکی نموونەیی رووت (بەو دوور لە واقعو راستی)، کاتێ ئارەزوو هەوەس جڵەوی عەقڵ دەگرێ روە ئازادییەکانی عەودالّی حەقیقەت کۆت دەکرێن، ئەو دەم لە دیمەنە راستییەکان دوور دەکەوێتەوە لە دنیای خەودا دەبێتە مەلەوانو دەست دەکاتە بڕوبیانوو هێنانەوە بۆ ئەو شتانەی ئارەزوو هەوەسەکانی بە چاکی دەزانن، دوور دەکەوێتەوە لە راستییەکان کە ئەمەش وای لێدەکات سەنگەری دژ بە حوکمەکان هەڵبژێرێ، بە جوانی دەبینین کە چۆن زۆرێك لە خەڵکی بوونەتە بەندەی ئارەزووەکانیانو ئەمەش بەرەو تیاچوونی بردوونو هزریشیان بە هۆی ئەو کۆتو

بەندەوە بووەتە کۆیلەی هەواو هەوەسی، ئەمەش دووری خستۆتەوە لە راستیو بەرەو نەمان راپێچکردون، هەنگاونانێ بۆ بڕیاردان و هەڵهێنجانی حوکمێك کە رزگاری بکاتو رەهای بکات، لە کاتێکدا ئەو حوکمە خۆی هاوار ئەکاتو لە واقعدا بەجوانی روون و دیارو ئاشکرایە.

قورئانی پیرۆز دیمەنگەلێکی لەم جۆرەی باس کردووە، لەوانە، ئەوەی لە سورەتی (الواقعە)دا باسی دەکات لە خۆلێنەزان کردنی ئەوانەی نامەی کردەیان بە دەستی چەپ وەردەگرن سەبارەت بە زیندووبوونەوە، بەوەی کە نغرۆبوون لە خۆشگوزەرانیو ئارەزوو هەواو هەوەسداو هزریان بە هۆیەوە توانای نەبوو لە بینینی ئەو بەڵگە زیندووانەی کە رێنموونی مرۆڤ دەکەن بۆ بڕوابوون بە زیندووبوونەوە، یاخی کردو وای تێگەیاند ژیان تەنها ئەم ژیانەیەو ئەو خۆشیو رابواردنەی تێیدایە، خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُتْرَفِينَ * وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ * وَكَانُوا يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَاباً وَعِظَاماً أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ * أَوَ آبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ) (الواقعة: ٤٥ـ ٤٨).

دواتر قورئان هانیان دەدا لەسەر هەوڵدان بۆ ئازادکردنی هزریان لە کۆتو بەندی هەواو هەوەس، رایهێنان بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ خۆڕسکیو ئازادی تا ئاراستە بکرێ بۆ بینینی واقعو بیکاتە خاڵی سەرەتا بۆ گەشتن بە بڕوابوون بە زیندووبوونەوە، کە ئارەزوو هەوەس بووبوویە پەردەیەك و لێی شاردبوویەوە، خوای گەورە هزرەکان رادەچڵەکێنێو دەفەرموێ: (أَفَرَأَيْتُم مَّا تُمْنُونَ * أَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ) (الواقعة: ٥٨ـ ٥٩)، (أَفَرَأَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ * أَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ) (الواقعة: ٦٣ـ ٦٤)، (أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاء الَّذِي تَشْرَبُونَ * أَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ) (الواقعة: ٦٩).

ئیمام موحەممەد عەبدە زۆر بەجوانی وێنای ئەو کەسانە دەکات کە هەواو هەوەسیان جڵەوی هزریان گرتووەو راپێچی دەکەن بەرەو ئەو رووەی هەواو هەوەس مەبەستیانە، دەنووسێت: (هەرکات شتێکیان پێ رابگەیەنرێت سەبارەت

به پێغەمبەرایەتی و ئاینەکان، لە دەروونیان پاڵنەرێك هانیان بدات بۆ گوێگرتن بـە هـەموو توانایەکیانـەوە کـە پێیـان بەخـشراوە لـە ئیختیـار بـەرەنگاری دەبنـەوە، خۆیان دوور دەخەنەوە لێی، پەنجەکانیان دەخەنە گوێیانەوە نەبادا بەڵگـەکان بـە هزریـان بگـاتو پاڵیـان پێوەنـێ بـۆ باوەڕهێنـان و خۆبەدەسـتەوەدان، ئـەو دەم دووربخرێنەوە لەو چێژەیان وەریان گرتووە یان ئەوەی حەزیان لێیە وەریبگرن کە ئـەوەش نەخۆشـییەکە لـە دڵو دەروونـدا)[1]، هـەرکات زەبـرو هێـزی باوونـەریتو چاولێکەری زاڵ بوو بەسەر هزردا، ئازادی تێڕامان لێ بگیرێتەوە، ئەوکات تێـڕوانین و بیری لە واقعی ژیان دوور دەکەوێـەوە تا ڕۆینـدەی بـاوانو مێـژووی ون دەکەنـە کەرەسەتەی تێرامـانو دەیکەنـە پێـوەرو حوکمێـك ئـەورۆی پێدەکێـشێ دەیکەنـە نموونەیەکی مێژوویی‌و گەردنی بۆ کەچ دەکـەن، نـەك وەك توێژینـەوەو وەرگرتنـی پەندو ئامۆژگاری لێی، قورئانی پیرۆز زۆر بە توندی نـەرێی کـردووە بەرامبـەر ئـەم زەوت کردنەی ئازادی هزرو لەکارخستنەی و رەچاونەکردنی واقع و ژیـانی رۆژانـە، خوای گەورە سەبارەت بە هۆزو گەلی ئیبراهیم دەفەرموێ: (وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْـرَاهِيمَ * إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ * قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَاماً فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ * قَالَ هَـلْ يَـسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَـدْعُونَ * أَوْ يَنفَعُـونَكُمْ أَوْ يَـضُرُّونَ * قَـالُوا بَـلْ وَجَـدْنَا آبَاءنَـا كَـذَلِكَ يَفْعَلُونَ) (الشعراء: ٦٩ـ٧٤). ئەو خەڵکانـە کـۆتی چـاولێکەری باوبـاپیر لـە ئاسـتی واقعـدا کـوێری کردبـوون، کـە ئیـبراهیم پێغەمبـەر دەیویـست هەڵـەکانیان راسـت بکاتەوە هزریان رزگار بکات لـە سـتەمی چـاولێکەری و واقعیانـە بـە دوی راسـتی‌و حەقیقەتدا بگەڕێن، فیرعەوونو هاوشێوەکانیش هەمان شێوە بوون، موسا چەندین بەڵگـەی روونو ئاشـکراو دیـاری بـۆ هێنـان لەسـەر راسـتی بانگەوازەکـەی بـۆ بەکخواناسی، بەڵام ئەوان پشتیان لە هەمووی کرد وتیان (قَالُواْ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّـا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا وَتَكُونَ لَكُمَا الْكِبْرِيَاء فِي الأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ) (يـونس:

[1] محمد عبده ـ رسالة التوحيد ـ ١٠٤.

٧٨)، بەپــەردەو رووپۆشــی باوونــەریتی و پــیرۆز زانینــی باووبــاپیران ئاوڕیــان لــە راستی واقع نەدایەوە، روویان لێوەرچــەرخان، هــەرکات هــزر کۆتو بەنــدی خرایــە سەر وەك هەتیویٚ سەیر کراو ویسایەتی روحــی لــە پێــشگوییانەوە رێشوی گیرایــە دەست، یا بەندی سۆفیگەری لەســەر دانــرا، ئــەو دەم رێــی خــۆی ون دەکــاتو لــە واقعــی بەرهەســتەو نیــشانەو بەڵگــە گەردوونیــەکانو ژیــانی مرۆڤــی لــە روودا دادەخــریٚو دەیداتــە جیهــانی خــەیاڵو ئەندێــشەیەکی وشــکی بــیٚ بنــەماو لــەوێوە چاوەڕێی خۆشگوزەورانی عەقڵی دەبێت، چونکە پێی وایە کــە راســتیو حەقیقــەت لە ژێر پــەردەی خۆدانەدەست دنیایەکی روحی پیرۆز کراوە.

بەڵام ئەوەی واقعی ناوە دواکەوتنی کڵاوی بابردوو؟

لەبەرئــەوە داگیرکــەرانی رۆژئــاوایی لــە جیهــانی ئیــسلامییدا بوونــە چــاکترین پاڵپشت بۆ بزاڤە سۆفیگەرییەکانو سەرانیان زۆر لــە خــۆ نزیــك دەکــردەوە، هــانی دەدان لەسەر کــارکردنو راهێنــانی خــەڵکی لەســەر ئــەو جیهانــە رۆرحیــەی ئــەوان دەیخوازن، تا خەڵکی نەزانن کە پلانی داگیرکاری بە کویٚ دەگــاتو ئــەنجامی چــی دەبێت و بێئاگا بن لە واقعو رۆژ.

هەر کات کۆت بخرێتە سەر رادەربڕینو نەیەڵرێت دەنگی لێوە بێتو رەخنەیەك دەرببڕێت، وە ئازادییەکانی هزر کورت هەڵبهێنرێت لــە رێــی داپلۆســینی فکــری یــا سیاسی، ئەو دەمە دیتر واقیع وەك ئەوەی هەیــە نابینــیٚ و ناتوانــیٚ رای گونجــاوی سەبارەت بدات.

لــەوەها بارودۆخێکــدا رادەربــڕین چ ســودێکی دەبــیٚ ئەگــەر نــەتوانیٚ گــۆڕانو چاکسازی بکات؟ تەنها لەگەڵ خۆیدا دەژی لەناو بەهایــەکی خودیــدا مــت دەبــیٚ و خۆ دەبەستیٚ بە چەند بنەمایەکی میسالییەوە کە هیچ کات نابنە زەنگی مەترســی بــۆ دەســەڵات و چەوســێنەرانی خــەڵکیو مرێنــەرانی رای ئــازاد، لەبەرئەوەیــە تــا چەوساندنەوەو کپکردنی رای ئازاد هەبیٚ، ئەو دیاردە هزریە میسالیانە لەناو تــاكو گرووپدا تەشەنە دەستێنیٚ، چــونکە هــەرکات هــزر قەدەغــە بکــریٚ لــە تێڕامــان لــە

واقیعو چاکسازیی کردن بۆ خۆی، دونیایەکی ئەفسوناوی و خەیاڵی دروست دەکات و دەیکاتە خاڵی سەرەتاو کۆتا لەهەر بزاڤێکی بیرۆکەییدا، پیدەچێ هەندێ گرووپی شیعەی ئیشراقی مەشرەب لەبەر ئەو هۆیە سەری هەڵدابێ لە زەمانێکی چەوساندنەوەی سیاسییدا، هەروەکو چۆن هەندێ گرووپی ئیسلامی میسالی مەشرەب لە دایك بووی کەش‌و هەوای چەوساندنەوەی فیکری‌و سیاسیی بوون لە دەوڵەتەکانی عەرەبیدا.

هزری ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی هزرێکی واقیع بینانەیە وەك پێشتر باسمان کرد، بەڵام جارناجار بۆشاییەك لەم ناوەندەدا هەست دەکەین کە خۆی لە داروتان‌و سەرکێشیدا دەبینێتەوە، ئەگەر بە وردی تێڕامێنین دەبینین هۆی ئەوە بە زۆری دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی مەیدانی ئازادی لە رادەربڕیندا، روونترین بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەمەیە کاتێ هزری زانایان کە ئازای رادەربڕینیان لە ئیجتیهاد دا لێگیرا دەستەوسان بوون لە چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی رووبەڕووی موسڵمانان بوویەوەو نەیاندەتوانی ئاراستەیەکی شەرعیانەیان بکەن، بەڵکو تەنها لە چوارچێوە فیقهی گریمانیدا دەژیان. وە چۆن دیکتاتۆری سیاسی لە وڵاتانی ئیسلامی دواکەتوودا وای لە هزری ئیسلامی کرد کە لە بواری سیاسییدا ویستی سەرەتایی میسالی زاڵ بێت بە سەریداو نەتوانن واقیعییانە بیر بکەنەوە، کە ببێتە هۆی دروست بوونی تێڕوانینی واقعی لە دام‌و دەزگاکانی دەسەڵات و شێوازی گونجاو لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی رۆژگاردا، لە دەرئەنجامی ئەمەش فیقهێکی ئیسلامی ناواقیعی هاتە گۆڕێ، تەنانەت لە سەردەمی گەشەو پێشکەوتنی شارستانیەتی بە پێچەوانەی فیقهی سەوداو مامەڵەی هەمان سەردەم، بە کورتی دەتوانرێ ئەوە بوترێ ئازادی رادەربڕین بە هەموو ئاستەکانیەوە دەبێتە هۆی واقیعگەری لە تێڕامانی هزری، کپکردن نەهێشتنی ئازادی دەبێتە هۆی رووکردنە فکری میسالی دوور لە واقیع.

## ٦ـ ئازادیی رادەربڕین و مەنهەجی رەخنەگریی:

ئـازای رادەربـڕین هۆکـارێکی گرنگـە بـۆ پێکهێنـانی هـزر لـە سـەر ئاکـاری بەراوردکردنو رەخنە لە هەوڵدانیدا بۆ بەدەست هێنـانی مەعریفـەت. کاتـێ ئـازاد دەبێ لە رێنمونی ئەملاولا و راسپاردن و پێسپێرێ ئەو دەم بـواری بـۆ دەرەخسـێ بۆ هەڵوێستە کردن لەسەر ئەنجامە جۆراوجۆرەکـان لـەو بابەتـەی دەیـەوێ ئیـشی تێدا بکات بـەراوردکردن لـە نێـوان هەڵوێـستە دژەکانـدا، بەمـەش هـەلی چـاکی بـۆ دەرەخـسێ بـۆ خوێندنـەوەی دیـاردە لاوازو بـەهێزەکان، وە ئەوانـەی راسـتو دروستو هەڵـەن لـە ئـەنجامی ئـەو پـشکنینەی ئـەنجامی داوە، بەمـەش دەتوانـێ بیکاتە تێڕوانینێکـی راسـتو حـوکمێکی دروسـت، ئەمـەش رێو شـوێنی ئیـبراهیم پێغەمبەرە (علیە السلام) کاتێ بە هزری ئازادی تێڕاما لـە دیـاردە جیاوازەکـان لـە پێناو ناسینی خوای گەورەدا، زۆر تێڕاما لە بتەکانو خواکانی گەلەکـەیو هـەتاو و مانگو ئەستێرەو لە نێوان ئەوەی لە دڵو دەروونیدایە سەبارەت بـە زاتێـك کـە لـە هەموویان گەورەترو باڵاترە، بە بەراوردکردن و پشکنینی خاڵە لاوازەکانی ئەنجامە سـەرەتاییەکانی بـۆ دەرکـەوت، وە لـە دیـاردە نادیـارو بـەهێزەکانی گریمانـەکان، بەمـەش گەشـتە رای راسـتو دروسـت (إِنِّـي وَجَّهْـتُ وَجْهِـيَ لِلَّـذِي فَطَـرَ الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفاً وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ) (الأنعام: ٧٩) کاتێ کۆتی راسپێرێ دەخرێتـە سەر هزر بە هۆی چاولێکەری و باوو نەریتەوە یـا بـە هـۆی کەسـانی دەسـەڵاتدارو ناوەنـدی دەسـەڵات بـە هـەموو شـێوازە جوداکانیـەوە، ئـەو دەمـە لـەناو هـەموو ئەنجامەکاندا تەنها یەك دەرئەنجام و یەك رەنگ دەبینێ، هۆکارەکانی بـەراورد لـە دەرونیـدا ناجۆشـێ، ئـەو کاتـەش ناتوانـێ پـەی بـە خاڵـە لاوازو بـەهێزەکانی ئەنجامـەکانی تێڕامـان بـەرێت، ئـەو دەمـەش فکرەکـەش هێڵێکـی کێـشراوی یـەك ئاراستە دەبـێ، کـە دەرئەنجامـەکانیش زۆر کـات بـەرەو حـوکمی هەڵـەی دەبـەن، ئەمـەش حـاڵی قـەومی فیرعـەون بـوو کاتـێ هزریـان داخـرا بـوو و تـەنها ئـەوەیان دەبینی کە فیرعەون پێی رادەگەیاندن، کاتێ پیاوە بڕوادارەکە هەندێ شـتی تـری

بۆ پێشنیار کردن سەبارەت بەو هەڵوێستەی فیرعەوون کە هەیبوو لەمەڕ کوشتنی موسا پێغەمبەر، گەلەکەی کۆکردەوەو بۆ قایل کردنیان بەو ئیشە، وە لە پێناو پیادەکردنی ئەم یەك هەڵوێستە هەڵەیەدا (قَالَ فِرْعَوْنُ مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ) (غافر: ٢٩). ئەو گەلەش تەنها دوکەوتەی ئەو هێڵە بوون کە فیرعەون پێی نیشان دابوون، وە پشتیان لەوپێشنیازە دەوڵەمەندانە کرد کە پیاوە بڕوادارەکە پێشکەشی کردن، دەرئەنجامەکەشی گومڕابوونی گەلەکە بوو.

کاتێ بوار دەکرێتەوە بۆ ئازادی رادەربڕین لە ئاستی راگەیاندنیو بەڵگە لەسەر هێنانەوەو هزر لە رووی رای پێچەوانەو ئەنجامی بەرامبەری دەکرێتەوە، وە لە رێی پەیڤینەوە بەراورد کردنێ دروست دەبێ لە نێوان راکاندا کە ئەو کات رای لاواز دەکەوێتو رای بەهێز و راست سەردەکەوێ، ئەمەش شتێکی بەڵگەنەویستە، بەڵام ماندنو نەهێشتنی رادەربڕینێکی ئازادو گفتوگۆو وتوێژ تەنها بەرهەمی داخرانو خۆبەستنەوەیە بە رایەکەوە پەرشو بڵاوبوونو دەمارگیری بۆ ئەو رایە، لەو حاڵەتەشدا تەنها لە یەك رەهەندەوە راوبۆچوونەکان دەبینرێن کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەهەڵەدا چوون لە زۆربەی کاتدا.

ئەمەش دەبێتە هۆی چڕۆکردنی دەمارگیری بۆ راکانو پەرتەوازەبوونو رووکردنە دۆڵو شێوی جیاوازو دەست گرتنی کوێرانە بەو رایەوە، لەهەر کەشوهەوایەکدا کە ئازادی رادەربڕینی تێدا کپ کراوە، وە هزریی بە لاوازی و سستی گەشە دەکات و لەم کەشوهەوایەدا ئەم ئازادییەی تێدا دەستەبەرنەبێت راستییەکان ئاوەژوو دەکرێن، چەندە جوانە پەروەردەی پێغەمبەرانە ﷺ، لەم بوارەدا کرانەوەیەك دەبینین لە سەر وەرگرتنی دژەکانو بواردان بە ئازادی هزرو بەڵگەهێناوە بۆ بۆچوونەکانو رەخنەگرتن، پێغەمبەر ﷺ دروشمێکی هەڵگرتبوو کە بریتییە لە (أشيروا عليّ أيها الناس) ئەمەش دروشمێکی پەروەردەییە، مەبەست لێی پەروەردەکردنی موسڵمانانە لەسەر بیری رەخنەگرانەی بەراوردی،

بـە بواربەخـشین بـە ئـازادی بـەرفروان لـە قـسەو بەلگەهێنانـدا، ئـەوەش نـەبیٚ پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەزانیٚ راستیو هەق لە چیدایەو دەبێت چی بکات[1].

ئەو ئازادی رادەربڕینەی کە بلاوبووەو لـە نێـو موسـلمانانـدا لـە سـەردەمەکانی یەکەمدا فاکتەرێکی بەهێز بـوون لـە پـەروەردەی هـزری ئیـسلامی لەسـەر ئاکـاری رەخنەگری، کە ئەمەش بە جوانی لە بوارە فیقهـیو ئاینــزاینییو فەلـسەفییەکاندا دیـارو روونـە، کـە تێڕوانینـە فقیهییـەکان تێـدا سەرچـاوەیان لـە بـەراوردکردنێکی فراوانــەوە وەرگرتــووە کــە لــە دایکبــووی کــەشو هــەوای پــەیڤینی ئــازادن، ئــەو دەمارگیرییە ئاینرایەی کە نەریٚ دەکات لەبەرامبەر رای پێـچەوانەدا لـەم سـەدانەی دوایـی داکـەوتنی ئومەتـدا هاتنـە گـۆڕیٚ، کـە ئازادییـان لـە کۆشـنیدا نەهێـشتو جاروبارەش دەرگای کۆشینیان دادەخست.

دەسەلاتیش رۆلێکی خۆی هەبوو لە ئاراستە کردنی هزردا بۆ ئاینـزایەکی دیاری کراو ووەلانانی ئاینڕاکانی ترو کورت هەلهێنانی بۆچوونەکان تەنها لەیەك ئاینرادا، بەمەش دەرگای کرانەوە داخرا لەسەر دیدگاو بۆچوونە جیاوازەکان کە خۆیان لە ئاینـزا فقهی و بیروبڕواییەکانی تردا دەبینێتەوە[2].

## ٧ـ ئازادیی رادەربڕین و بابەتیی‌بوون :

هەرکات هزر پەردەپۆشکرابوو لەگەڕان و توێژینەوە بە هۆکارەکانی ئارەزوو هەوەس، ئەم هۆکارانە بەو شێوە ئاراستەی دەکەن کە ئارەزووە خودییەکان دەیخوازن، حوکم دانەکانیش لە سەر خواستە دەرونیە خودیەکان دەبن. چاولێگەری و بەدواداچوونی باوانیش هەمان شێوازە، هێندە هەیە ئاراستە

---

[1] بۆ خوێندنەوەی چەندین نموونەی جوان بگەڕێوە بۆ محمد یوسف مصطفى، حرية الرأي في الاسلام ٧٠و دواتر.

[2] بۆ راڤەی ئەمە بگەڕیوە بۆ محمد الغزالي ـ دستور الوحدة الثقافية بين المسلمين، ١٢٥و دواتر.

کردنەکەی هەندێك لە خودی تاکە و دەبیات بۆ خودێکی کەمێ فراوان، ئەمەش وای لێدەکات دونیای دەرەوە نەبینێو ئەو راستیانە پشتگوێ بخات کە بابەتە دەرەکییەکان دەیخوازن.

کاتێ هزر لە دەرەوە رێنمونی بکرێ، راسپێرانی دەرەکی مەبەستی ئاراستە کردنی هزر دەبێت بۆ مەبەستو زانیارییەکانی خودو تێرکردنی نیازەکانی، هەوڵدەدات هزر ئەو هێڵە تێنەپەرێنێ کە بۆی دیاری کراوە پێدەچێت ئاراستەی پێچەوانەی ئەو شتانە بێت کە پێشتر بۆی دیاری کراوە ئەو دەمەش شێوازەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو بابەتەی توێژینەوەی لە سەر دەکاتو دەیەوێت بگاتە دەرئەنجامێکی بابەتیانەی بە دوور لە ویستو ئارەزووە دەروونییە ئاراستە کراوەکان، ئیتر لەم نێوەندەدا حەقیقەتو راستی ون دەبێت.

بە پێچەوانەی ئەوە هەرکات هزر ئازاد بێت لە ئارەزووە خودیەکان و راسپێری کەسانی تر، پەیوەندییەکی راستەخۆی هەبێت لەگەڵ بابەتی توێژینەوەکەیدا ئازادانە بیخۆنێتەوەو خودی تێدا وەدەرنێ، ئەو دەم راستی ئەو شتەی وەك خۆی بۆ دەردەکەوێت، نەك وەك ئەوەی کە هۆکارە دەروونییەکان مەبەستیانە ببینن، پێدەچێت ئەمە یەکێ بێت لە خواستەکانی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەمەڕ پەروەردەی موسڵمانان کە دەفەرمێ: "لاتكونوا امعة تقولون: ان احسن الناس احسنا، وان ظلموا ظلمنا، ولكن وطنوا انفسكم ان احسن الناس ان تحسنوا وان اساؤا تظلموا"[(1)]. ئەمە بانگەوازێکە بۆ ئازاد بوون لە هۆکاری ئاراستە کردنی کە بە هۆی چاولێکەری کەسانی ترەوە، بۆ ئەوەی هزر بگاتە ئەو راستیەی کەستەم چەند خرابە تێروانێکی بابەتیانە بۆی، بەمەش خۆی لێ بە دووربگرێ، نەك پاساوی بۆ بهێنێتەوە لە بەر ئەوەی کەسانی تر لەبەر هەندێ بەرژەوەندیو مەرامی خودی ئەنجامی دەدەن.

---

[1] ترمذي، كتاب البر والصلة، باب: حديث ٢٠٠٧/٤ـ ٣٦٤.

ئازادی رادەربڕین لە ئاستی ئاشکرا کردنو وتووێژکردنیش هەمان ڕەوگەی دەبێ، یەکێ لە پایەکانی دەربرینی راو بانگەشە بۆ کردنی ئاشکرا کردنی ئەو ئەنجامەی کە لە رێی پەیڤینەوە پێی دەگەی بە دوور لە خواستە خودیەکان، ئەوەی کە وەك چڵك بە سرشتی مرۆڤەوەیەو بەو هزر لێی بێئاگا دەبێ، یا زادەی رازو نیازێکە بۆ بە دەست هێنانی مەرامێ، پەیڤین هەمو ئەوانە ئاشکرا دەکات، ئاراستەکان دەگێرێتەوە بۆ توێژینەوەی باباتەکە بۆ لای دەرئەنجامە راستەکانی کە خواستی بابەتیانەی بابەتەکەن. ئێمە زۆرجار هەندێ حوکم بەدەست دەهێنین هۆکەیان بە سەردا دەدەین کەلە راستیدا لە بەدەستهێنراوی خودنین بەڵکو ئێمە دەیان بڕین بەسەر کێشەو بابەتەکەدا ئەویش کاتێ ئەو حوکمانە لە مەیدانی پەیڤیندا دەیخەنە ڕوو.

کاتێ ئازادی رادەربرین کپ دەکەین، ئەو دەمە هزر دەگەڕێتەوە بۆ دواوە بۆ دۆزینەوەی پێوەرێ لە توێژینەوەو حوکمداندا بەدوور لە خواستە بابەتییەکان کە دەبێت ئەوانە بکرێنە پێوەر بۆ حوکمەکان، چونکە ئەو کات ئەو دەرئەنجامانەی پێیان دەگات تەنها لە سنوری خودی مرۆڤدا قەتیس دەمێنێت و نابنە کەرەستەی رەخنەی دەرەکی کە دەبێتە هۆی گەیشتن بە دەرئەنجامی بابەتیانەی ئەو بابەتە.

پێغەمبەری خودا ﷺ بواری دەرەخسان بۆ هاوڵان بۆ ئەوەی ئازادانە رای خۆیان دەربڕن، بۆ ئەوەی هەر کام هەرچی پێیە بیخاتە روو، مەسەلەکە بابەتیانە توێژینەوەی لە سەر بکرێو بە دووربێ لە ئەگەرو گومانی خودی. بەمەش هاوەڵان پەروەردەیەکی فکری کرانو ئەمەش هەڵینان بۆ خوگرتن لە سەر توێژینەوەی بابەتیانە. جوانترینو دیارترین نمونەی ئەم راستیەش ئەوەی رویدا دوای غەزای حونەین، لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پشکی زیاتری دایە تازە موسڵمان بوان بە مەستی زیاتر نزیککردنەوەیان لە ئیمانو کەمترین پشکیش بۆ ئەنسار، ئەمانیش لە دەروونیاندا شتێ دروست بوو بەرامبەر ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەر ﷺ، هەرکام

گومانێکی دەبردو بە هزری خۆی شیکردنەوەی بۆ ئەم دیاردەیە دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بواری بۆ کردنەوە بۆ ئەوەی هەر کام رای خۆی دەربڕێ بەرامبەر ئەو رووداوە، پێغەمبەر ﷺ ڕاو بۆچونی خۆی بۆ ئاشکرا کردن لە روانگەی ئەو واقعەی کە ئەو ئەو هەڵوێستەی لە سەر وەرگرتوە، ئەو دەم ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ئەو تێروانینە بابەتیانەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەو ئیشەی لە سەر بنیاد کردبوو، ئەگەر هاتبا گوێ بە راو بۆچونەکانیان نەدایە، یا ڕاکانی ئەوانی بمراندایە ئەو دەم شتێکی تر دەبوو[1].

## ٨ ـ فاکتەری ئازادیی رادەربڕین لە یەکبوونی هزرییدا بە شێوەیەکی گشتی:

پێشتر باسمان کرد هۆکاری یەکەمی یەکبونی هزری بریتیە لە هۆکاری رۆکەوتنی (قناعە) ئایدیۆلۆژیاو ئاین بەشێوەیەکی تایبەت، دەتوانین هۆکارێکی تریش بۆ زیاد بکەین کە ئەویش هۆکارێکی بنەڕەتیە بۆ دورست بوونی یەکبونی هزری بە هێوراندنی (تشکیل) هزر لە سەر ئاکاری مەنهەجی هاوبەش، ئەوانەش ئاکارگەلێکن لە ئێستەدا بۆ خۆئاماکردن لە پێشترن تاپیادەکردن لە زەمینەو واقعدا. وە لە گونجاندنەوە نزیکترن بۆ روودانی وەك کردار. ئەمەشمان دوای تاوتۆی کردنی ئاسەواری مەنهەجی بیرو بڕوای ئیسلامی لە سەر پێکهێنانی هزری بڕوادار لە سەر ئەو پێنج ئاکارەی پێشتر باسکران روون بۆتەوە.

ئەو ئاکارە مەنهەجیانە کاتێ دەتوانن لە دونیای بووندا خۆیان ببینەوە کە بە هۆکاری چالاك پاڵپشتی بکرێن، گرنگترین ئەو هۆکارانەش ئازادی رادەربرینە، هەر کات هزرەکان کارتێکراو بن بەو راستیانەی کە لە بیروباوەڕەوە وەرگیراون، بەڵام بێ

[1] بگەڕێوە بۆ محمد يوسف مصطفى، حرية الرأي ٨٧ دواتر، بۆ تەواوی رووداوەکەش بگەڕێوە بۆ ابن هشام ـ السيرة النبوية ١٩٦/٤ دواتر.

هۆکاری چالاکی کە خۆی لە ئازادی رادەربڕیندا دەبینێتەوە ئەو ئاکارە مەنهەجیانە بە بەهێزی خۆیان دەمێننەوە، بێ ئەوەی بتوانن چالاکی بنوێنن لە روانینی مەعریفی، کە دەتوانی مەبەستی یەکبونی هزر بێنێتە دی بە شێوەی ویستراو.

ئازادی رادەربرین، کە موسڵمانان پشکی چاکیان تێدا هەبووە، هۆکارێکی چالاك بوە لە دیار کەوتنی ئاسەواری مەنهەجی بیروڕا لە قۆناغی ئامادەکاری بۆ حاڵەتی کارکردنو ئەکتیڤی، بەمەش زۆرێك لەو ئاکارە مەنهەجیە هاوبەشانە پیادە بوون لە سەر ئەو شێوازەی باسمانکرد. کاتێ ئەو ئاکارانە بونە واقعێکی هاوبەشی هزری ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی رۆڵێکی گەورەو چاکی بینی لە یەکبوونی هزری نێوان موسڵمانان. کەواتە دەتونین بڵێن ئازادی رادەربرین بووە هۆی هاتنەدی ئاکاری مەنهەجی هاوبەشی نێوان موسڵمانان، هەر ئەوانەش بوونە هۆی دروست بوونی یەکبوونی هزری نێوان موسڵمانان. لە ڕێگەی ئەو یەکبوونە هزریەشەوە ژیانی ئیسلامی لەرووی تیۆریەوە کە خۆی لە زانستەکاندا دەبینێتەوە شێوازێکی جوانو شیاوو تەواوی وەرگرت. هەر بە هەمان شێوە لە رووی پراکتیکیشەوە کە خۆی لە رووکاری ژیاری کردەیی جیاوازدا دەبینێتەوە. بەمەش وەکو بەشێکی لێها ت کە هەموو لایەنەکانی ئیسلامی بە یەکەوە بەستەوە.

دەتوانین وێنای ئەوە بکەین بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە ژیانی ئیسلامی چۆن دەبێ ئەگەر هزری موسڵمانان هەڵگری ئاکاری پێچەوانەی وەك بەش بەشیو پەرتەوازەیو خۆپەسەندیو تاکڕایی بێت، ئەو دەمە ئاڵقە بە یەك ستوونەکانی یەك یەك لێکدەترازێنو هەڵدەوەشێن. دەشتوانین بۆ زانینی کاریگەری ئازادی رادەربڕین لەسەر یەکتر هزری موسڵمانان بەراورد بکەین لە نێوان چەند ماوەیەك ژیانی موسڵمانان کە ئازادی رادەربڕینیان تێدا جیاواز بوو.

لە رووی پراکتیکیەوە، بەڵکو بە بەراوردکردن لە نێوان بوارە جیاوازەکاندا کە بەشی ئازادی رادەربرینی تێدا جیاواز بوو، ئەگەر لە سەر شێوەی یەکەم بەراودی بکەین لە نێوان چوار سەدەی یەکەمو سەدەکانی پاش ئەوانە، بە تایبەتی ئەم

دواینانەیان ئەو دەم دەگەینە ئەوەی لە سەدەکانی پێشوودا ئازادی رادەربرین بە شێوازێکی بەر فراوان لە نێوان موسڵمانان‌اندا بڵاوبووە، وەك یەکیش لە هەموو ئاینەکاندا کۆشینی فکری یا ئۆپۆزسیونی سیاسی باوەکو بە ئەندازەیەکی رێژەیش بوو بێ، ئەویش لەو وتووێژە بەرفراوانەی بواری فیقهو عەقیدەو فەلسەفەو ئەوانی تر..، هەروەها ئەوەی کە دەبینرێ لە راوبۆچونی پۆزێتیفانەی ئۆپۆزسیۆنەوە کە مێژوو بۆمانی باس دەکات.

موسڵمانان لەم ساتە وەختانەیدا زیاتر یەکرێزو یەکبووبوون، ئەو یەکبوونە هزرییە یەکیخستبوون، بەرفراوانی روانگەی فیقهو عەقیدەییەکان جۆراو جۆریەکی بواری یەکبوونی فکرین کە بەرچاو دەکەون‌و هەموو موسڵمانانیش هاندەدات لە سەر بەرگری کردن لە ئیسلام لە رووبەڕووبوونەوەی بەرەنگاری ئاینی کەلتووری وەك ئەوەی غەزالی باسی لێوە کردووە، وە ئەو دەوڵەتۆکانەی کە لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا هەبوون وەك دابەشکردنێکی فیدڕاڵی بوون، هەموویان یەکدەست بوون لە جیهادو ئازادکردنی وڵاتانی ترو گەیاندنی ئاین بە ئەندەلوس‌و "ماوراء النهر". بەڵام لە چاخەکانی دوای ئەواندا کە دەمارگیری تایفەگەری نەشونومای کرد لە بواری فقهو عەقیدەدا موسڵمانان پەرتەوازە بوون‌و بێئاگا بوون لە ئاین‌و نەیانتوانی لە ئاستی رووبەڕووبوونەوەکاندا بوەستن‌و ببنە سەرخەری ئاینی خوا.

ئەگەر لە روانگەی دوهەمیشەوە بەراوردێ بکەین لە نێوان مەودای فیقهی‌و عەقیدەیی لەلایەك‌و مەودای سیاسی لەلایەکی ترەوە، بۆمان روونده‌بێتەوە پشکی یەکەمیان لە ئازادی رادەربڕیندا زۆرترە لەهی دووهەم، ئەوەشمان بۆ رووندەکاتەوە کە چۆن موسڵمانان توانیان یەکبن لە سەر بنەمای عەقیدەو فقه، کە عەقڵی ئازادی پێگەیشتوو لە سەر بنەمای هاوبەش، کە دەبێتە رێبەر لە واقعدا بە ئەندازەیەکی بەرفراوان لە توانینیان بۆ یەکبوون لەسەر بنەمای سیاسی کە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی عەقڵی ئیسلامی ئامادەگی چاکی هەبێت بۆ توێژینەوە لە بواری سیاسەتدا بە ئازادیەکی بەرفراوان‌و بەربڵاویەوە. فقهی سیاسیی

نەیتوانیوە بنەمایەکی کردەیی وارێك بخات کە موسڵمانان یەکبخات بۆ دامەزراندنی دامو دەزگای سیاسی یەکبوو، بەڵکو بەردەوام لە خولگەی بیرو بڕوای "مجرد" دا ماخۆلانیەتی وەك ئەوەی لە نووسراوەکانی سیاسەتی شەرعیدا بەرچاو دەکەویٚ، ئەمانەش بوونەتە یارمەتی دەری بڵاوبوونەوەی دیکتاتۆری کە بوو بە هۆی پەرتەوازەیی، بەتایبەتی لەم سەدانەی دواییدا. بە ڕاستی ئازادی رادەربڕین هەرکات لە ناو موسڵماناندا پراکتیزە بێت دەبێتە هۆی دروستبوونی یەکڕیزیی، هەر چەندە بزر بیٚ یا لاواز بێت بە هەمان ئەندازەش موسڵمانان بەش بەش دەبن.

شیکارو توێژینەوەکانی ئێمە لەوەی رابورد سەبارەت بە یەکبوونی هزری موسڵمانانو کارایی ئازادی رادەربرین روویەکی گشتی گریمانیو گشتگیری مێژووی هەبووە. لەم بەشەدا هەوڵدەدەین گرنگی بە واقعی ئەوڕۆی موسڵمانان بدەین لە بواری چۆنایەتی یەکبونی هزری تێیدا.

وە کاریگەری ئەو بارودۆخە لە سەر یەکبونی لە ژیانی گشتیدا یا پەرتەوازەیی، پەیوەندی ئەوانیش بە ئازادی رادەربڕینەوە لە رووی مراندنو کارابونیەوە. دواتر هەوڵدەدەین لەو روانگەیەوە رووگەیەکی یەکبوو بڕیار بدەین لە هزردا بە چەند پێشنیارێکی کردەیی، کەلە سەر بنەمای ئازادی رادەربڕین دامەزراونو دەبنە هۆی وەدیارکەوتنی یەکبوون لە بوارە گرنگەکانی ژیانی ئیسلامیدا.

## ١ ـ ئازادیی رادەربڕین و واقیعی هزری ئیسلامیی:

ئەوەی هەندێ تێرامێ لە واقعی ئەمڕۆی موسڵمانان بە جوانی هەست بە حاڵو وەزعیان دەکات لە رووی یەکبونیو پەرتەوازبوونیانەوە، بە چاوی سەر ئەو پەرتەوازە بوونە دەبینێ کە هەموو رووکارەکانی ژیانی موسڵمانانی داگیرکردووە، نەك تەنها روکارەکانی ژیان، بەڵکو لە ناخی بنەما هزریە بزوێنەرەکانی ژیانیشدا، پێدەچێت ئومەتی ئیسلامی لە هیچ قۆناغێکی مێژوویدا دووچاری وەها پەرتەوازەییەك نەبووە کە ئەمڕۆ تێیدا دەژی. ئەم پەرتەوازیەش پەیوەندێکی بەهێزی هەیە بە واقعی هزری مەنهەجیەوە، ئەمەش پەیوەندیەکی راستەوخۆ بەربڵاوی هەیە لەگەڵ ئازادی رادەربڕینیدا وەك ئەوەی لەمەوداوا روونی دەکەینەوە:

### أـ رووکارەکانی پەرتەوازەیی لە واقیعی ئیسلامییدا:

روکارەکانی پەرتەوازەیی لە واقعی ئیسلامیدا تەنها روکارێ نییە بەڵکو چەندین روکارە، ئومەتی ئیسلامی توشی پەرتەوازەیی بووە لە رۆشنبیری گشتیدا کە لە ئاستی مەعریفەتی بیردۆزیدا خۆی دەبینێتەوە، هەر وەکو چۆن لە ژیانی ڕۆژانەو

دنیای پراكتیكیشدا ئاشكراو دیاره، له ئاستی یه‌كه‌میان له نێو ئومه‌ت دوو ڕۆشنبیری ناشیرین دیارن ڕۆشنبیریه‌ك گۆرانی بۆ رابردوو ده‌ڵێ، كه ده‌یكاته ته‌نها سه‌رچاوه بۆ مه‌عریفه‌ت، كه ئه‌وه‌ش مه‌عریفه‌تێكی تێپه‌ڕیوه‌و سه‌باره‌ت به ژیانی ئه‌مڕۆی موسڵمانان وه‌ك مردوو وایه، به دوره له هه‌وڵه مرۆییه‌كان بۆ ناسینی بوون كه ده‌بێته هۆی چاره‌سه‌ركردنی كێشه‌و گرفته‌كان، ڕۆشنبیریه‌ك پاڵی پێوه ده‌نێ بۆ به ده‌ست هێنانی ناسینی كلتوری ڕۆژئاوا و ده‌یكاته ته‌نها سه‌رچاوه.

یا نزیكه بیكاته ته‌نها سه‌رچاوه بۆ مه‌عریفه‌ت، كه ئه‌مه‌ش مه‌عریفه‌تێكی زۆر دووره به بنه‌ماكانی ئاین‌و كلتوری ئومه‌ت، نامۆیه به ئومێده‌كانی شێوازی بنیادنانی ژیان وه گه‌ڕاندنه‌وه‌ی سه‌روه‌ری ژیاری هه‌ڵكه‌وتوو زێڕین، له ئاستی دووهه‌میشدا دیارده‌كانی ژیانی ئیسلامی‌و شێوازه‌كانی جیاوازن له نێوان جۆری چاولێكردنێ كه ڕاگیره له سه‌ر پاشماوه‌میراتیه‌كان، وه ده‌درێته پاڵ ژیانی ئیسلامی له شتێ له‌و هه‌ڵه‌تێگه‌یشتنانه، وه نێوان جۆرێكی هاورده‌ی ژیاری ڕۆژئاوا كه كۆپییه‌كی زۆر خراپی لێگیراوه.

په‌رته‌وازه‌ییه‌كی تێدا دروست ده‌كات‌و ده‌یكاته چه‌ند گروپێكی ئاینڕایی له عه‌قیده‌و فقهدا، كه كێشه‌و گرفته‌كانی رابردووی هێناوه له‌گه‌ڵ خۆیدا، كه پێده‌چێت پاساوی واقعیشی پێ بێت به‌ڵام زه‌مانه ئه‌و پاساوانه‌ی لاداوه‌و دۆسیه‌ی ئه‌و بگره‌و به‌ردانه‌ش پێچراوه‌ته‌وه، به‌ڵكو جاری وا‌ده‌بێت كۆمه‌ڵه تاوانێ له‌گه‌ڵ خۆدا دێنێ كه هه‌ندێ به هۆی نیه‌تی خراپ یا هه‌ڵتێگه‌یشتنه‌وه ئه‌نجامی داوه، ئه‌مه‌ش نه‌وه دوای نه‌وه داگیر ده‌كات، كه كارایی له سه‌ر ئه‌مڕۆ هه‌یه‌و په‌رته‌وازه‌یی دێنێته گۆڕێ. ئه‌وه‌ش به جوانی دیاره له جیاوازی ئاینڕایی نێوان سوننه‌و شیعه، سوننه‌و ئیبازی، سه‌له‌فی‌و ئه‌شعه‌ری، ئه‌م جیاوازیه‌ش زۆرجار خولی كۆمه‌ڵێ شتێ غه‌یبیان داوه، وه‌ك بینینی خوای گه‌وره، ئه‌و سیفه‌تانه كه باسكراون‌و هاتوون، هه‌ندێ شتی هاوشێوه‌ی ئه‌مانه، كه ئه‌م بگره‌و به‌رده‌یه‌ش

دەگاتە ئاستێکی نەشیاو، وەك بە کافرکردنو نەفرەت کردن[1]، پێدەچێت جیاوازی لە فقهدا زۆر ساناترو بارسوکتر بێت لە عەقیدەیی، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ئەمە وادەکات بە هۆی دەمارگیریانەوە نەتخەنە بریاردانێکی هاوبەش کە بەیەکەوە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشە هەنوکەییەکانی موسڵمانان بدەن. دەردێکی تری ئەم ئوممەتەش پەرتەوازەیی سیاسییە کە زۆر بە جوانی خۆی دەرخستووە، ئەمەش تەنها لە دروستبوونی ئەو چەند قەوارە سیاسیەدا خۆی نابینێتەوە کە بارودۆخو رۆژ هێناونیەتیە نێو کایەی سیاسیەوە، بەڵکو لە هاوهەڵوێست نەبوونیشیان سەبارەت بەو کێشانەی ناوخۆش لە چوارچێوەی ئیسلامدا خۆی دەبینێتەوە، کە زۆرجار دەگاتە شەڕی خوێناوی وە هەڵوێستی دژ سەبارەت بە کێشە گشتییەکان کە پەیوەندییان بە چارەنووسی خودی ئیسلامەوە هەیە، کە زۆرجار وای لێدێ دەچێتە ڕیزی دوژمنانی ئیسلامەوەو دەبێتە هاوکارێکی دژان بۆ وەستان دژ بە ئیسلامو جێبەجێکردنی پلانو نەخشەی دوژمنان. کێشەی ئەفغانستانو ئەریتریاو باشووری سودان زیندووترین نموونەی ئەو ڕاستییەن، رابونی ئیسلامیش کە بەپاکی بۆ ئیسلام لێنەویوون بەدەر نەبووە لەم ئاکارو دیاردانە، وێڕای زۆربوونی ئەوانەی کاردەکەن لە ڕابوونی ئیسلامیداو بەزۆریش کەسانێکی ڕاستگۆو دڵسۆزن لە ئیشکردنداو بەڕاستی هەوڵدەدەن لە پێناو پیادەکردنی ئیسلام لەنێو کۆمەڵگای موسڵمانانداو دروستکردنی یەکبوونی ئیسلامی، لەگەڵ ئەمەشدا بە دوور نییە لە پەرتەوازەیی خوودی لەسەر ئاستی بۆچوونو تێڕوانین، هەروەها لەسەر ئاستی چۆنیەتی ئیشکردن، دەبینی چەندین گرووپنو هەندێکیشیان یەکبوونو لەیەکجیابوونەتەوە کە جاری وا هەیە ئەم بەرامبەریەك وەستانەیان دەگاتە ئەوەی یەکتری کافر بکەنو نەفرین لەیەك بکەن، جاری واش دەبێت دەگاتە ئەوەی دەستبخەنە خوێنی

[1] بگەڕێوە بۆ الترابي، قضايا الحرية والوحدة، ٣٦.

یەکترییەوە، کە ئەمەشیان سوپاس بۆ خوا زۆر کەمە. ئەوەی کە دەبێتەهۆی بەهێزکردن‌و چالاککردنی ئەم دوبەرەکییەو پەرتەوازیە یا لەدایکبوونی ئەو ڕووداوە گەورەیەیە کە موسڵمانانی تێکەوتووە، دەردی حیزبایەتی لە پەیکەرەی ئوومەتی داوە، ئەو دەم دەبینی کە پەرتەوازەییەکە زۆر دەبێت، ڕووەکان دژیەکدەوەستن، ئەم ڕووداوانەی دوایی کەنداویش نموونەی زیندووی ئەو ڕاستییەن.

**ب ـ پەرتەوازەیی هزریی وەك هۆکارێکی پەرتەوازەیی مسوڵمانان:**

هۆی ئەم پەرتەوازەییەی موسڵمانان چییە لەکاتێکدا قورئانی پیرۆزیان لەبەردەمدایە کە یەکبوون وەك نیازێکی گەورەو مەبەستێکی ئایینی بڕیاردەدات؟ دەگونجێ شتی زۆر بووترێ یا خاڵی زۆرو هۆکاری فراوان دەستنیشانبکرێن کە بوونەتەهۆی پەرتەوازەیی موسڵمانان، وەك دوورکەوتنەوە لە خواستەکانی ئاین، لاوازی ئیمان لای زۆرێ لە موسڵمانان، کاریگەری لاوەکی ژیارو شارستانیەتی ڕۆژئاوا، دواکەوتنی ئابوری کەبوەتەهۆی لاوازی پەیوەندی موسڵمانان کە زۆر ئاسانە ئەڵقەی ئەو پەیوەندیانە بپسێنرێ.... هتد، بەڵام تێڕامان بۆ هۆکاری بنچینەیی کە هەموو ئەوانەی لەخۆگرتبێ‌و لەژێر دەوارێکدا کۆی کردبنەوە وێڕای جیاوازییان، هەڵوەشانی یەکبوونی هزری نێوان موسڵمانانە، بەو مانایەی لە سەرەتای ئەم توێژینەوەیەدا باسمانکرد کە خۆی لەو پێنج ئاکارە مەنهەجیەدا دەبینێتەوە. دەکرێ بشوترێ ئەم لێکهەڵوەشانە دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارێکی بنچینەیی کە بریتیە لە کپکردنەوەی ئازادی ڕادەربڕین لە جیهانی ئیسلامیدا، بەربڵاوی دیکتاتۆری‌و تاکڕەوی تێیدا.

ئەو پەرتەوازییەی ئەمڕۆ دامەنگیری موسڵمانان بووە کاتێك لێی وردبینەوە دەردەکەوێت کە زۆربەی بەهۆی جیاوازی پەیڕەوە لەبیرکردنەوەدا، ئەمەش ئاکارێکە هەموو ئەو ئاکارە مەنهەجییە هاوبەشانەی لەناوبردووە کە دەبێتە هۆی یەکرەوی لەتێڕوانیندا، بۆچوونەکان یا هاوشێوەدەبن یا لەیەکەوە نزیك، هەوڵو

کۆششەکانیش یەکانگیردەبن بەرەو تەنها ئامانجێك، بۆشاییەکی دیارو بەرچاو هەیە لە مەنهەجییەتی هزردا، کە ماوەیەکە زاڵە بەسەر ئەقڵییەتی ئیسلامیدا بەشێوەیەکی گشتی، بەشێوەیەکی وەها کە دەرئەنجامەکان لەکاتی تێڕوانیندا جوداو جیاوازن، هەوڵو کۆششەکانیش لە مەیدانی کاردا پەرتەوازەو دوورن، دەرئەنجامەکەشی ئەم چەند دەستە بوونو گروپانەیە دەیبینین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەدیتر کەس لە سەر ئەو پەیڕەوە رەسەنە مابێ، بەڵکو تاکەتاکەیەك هەن کە لە سەر ئەو پەیڕەوە رەسەنەن کە یەکبوونی تێدایە لە سەر بنەمای ئاکاری هاوبەش، بەڵام کاروان هەمیشە هزری گشتی رێرەوی بۆ دیاری دەکاتو دەیخاتە گەڕ. یەکێ لە دیاردەکانی ئەو کەلێنەی هزری ئیسلامی کە ئەمرۆ دیارو لە بەرچاوەو بۆتە ئاکاری دیاری بەش بەشیە لە توێژینەوەو تێڕوانیندا، کە ئەمەش ئاکارێکە رایکێشاوە بەرەو رێڕەوێك لە دورکەوتنەوە لە ئامانجەکانو کورت هێنان لە یەکلابونەوە لە قسەکردن لە سەر تەنها چەند بابەتێکی دیاری کراو، هەروەها بوەتە هۆی ئەوەی کە نەتوانێ هەمەلایەنانە هەنگاوبنێو هەموو ئەو بابەتە دیاری کراوانە لەخۆ بگرێ لە پێناو گەیشتن بە حەقیقەتو راستی. تەنانەت لە چوارچێوەی چۆنایەتیەکی دیاریکراویشدا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان، وێرای دورکەوتنەوەی لە بواری توێژینەوەکانیشدا. ئەمەش بۆتە هۆی دووفاقەیی لە نێوان کلتورخوازانو رۆژئاواخوازاندا، کلتورخوازان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان تەنها مەرجەعیان کلتورەکانە بەبێ رەچاوکردنو ئاوڕدانەوە بۆ ئەو دەستاوردە مرۆییانە لە بواری زانستو مەعریفەتدا، بەڵام ئەوانیتر تەنها چاویان لە دەستاوردە مرۆییەکان بوو لە چارەسەرکردنی کێشەکانداو ئەوی کلتور هەیبوو پشتگوێییان خستو ئاوڕێکیان لێنەدایەوە. بەمەش هەرکام چاوی تەنها لەو شتە بوو کە هەڵیبژاردبوو، رێشوی هزریشیان دابوویە دەست تەنها ئەو بوارەی پێی قایل بوون، کە ئەمەش بە دوورە لەو عەقڵێەتە ئیسلامیەی کە لە سەردەمی خۆیداو لە

چاخی یەکەمدا هەبوو، کە لە هەموو بوارەکانی نیگاو دەستاوردە مرۆییەکاندا دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی راستیو کردەنەوەی گریێ کوێرەکانی ژیان.

یەکێ لەو ئاکارە باوانەی کە هەنو بۆتە هۆی پەرتەوازەیی لە هزردا، ئەو ئاکارەی کە نەیتوانیوە رێککەوتنو یەکخستنێ بکات لە نێوان شتە جیاوازەکاندا بۆ یەکبوونی هۆکارەکانیانو رێککەوتن لە نێوان بەرژەوەندیو مەبەستە جیاکاندا بۆ گەیشتن بە مەبەستو مەرامێکی هاوبەش، هزرێکە بەو چاوەوە سەیری دەرئەنجام و دیاردەکان دەکات کە چەند پارچەیەکی دوور لەیەكو لێکترزاونو هیچ پەیوەندەییەکان لە نێودا نییە، وە لە چوارچێوەیەکی ئیقلیمی تەسکشیەوە دەروانێتە بەرژەوەندیو ئامانجو مەبەستەکان، ئەمەش بۆتە هۆی چەند رێبازی لە کاروانی ژیانی ئیسلامیداو پەرتەوازەیی سیاسی لەکارکردندا وەك پێشتر باسکرا، ئەمەش دەرئەنجامی راڕاییە لە هزرو کورت هەڵهێنانی لە هەستکردن بەیەك هۆکارێ لە دیاردە سیاسییەکانداو زاڵ بوونی دەسەڵاتی زلهێزەکانو ئیستکباری جیهانی، هەروەها واشی کردووە کە نەتوانرێ هەست بکرێ بەوەی کە یەکبونی چارەنوسی ئیسلامی گەورەترین کاریگەرە لە رێنمونی کردنی هەوڵەکانو پەلەکردن لە بەستهێنانی دەساوردەی شارستانی، کاتێ چارەنووسی ئیسلام دەبێتە مەرامو مەبەستی تاکی موسڵمان، بەڵام ئەو وای لێهاتووە لە چوارچێوەی ئیقلێمیکی بەرتەسكو رەگەزپەرستی خاكو خاکپەرستیدا لە دوی دەگەڕێ، یەکێکی تر لە دیاردەکانی کە لە ناو خەڵکیدا هەیەو بەرچاوە داروتاندنو نموونەی میسالییە لە هزردا، ئەمڕۆ کاروانی فیکری ئیسلامی بەزۆری وادەبینرێ یا لە سەودا سەری رابردوداو نە کلتورە کۆنەکە ئەجوێتەوەو حوکومو چارەسەرەکانیش لەوێوە دێنێ، یان لە سەوداسەری داهاتوودا ون بووە، کە خەیاڵی پاشەڕۆژی ئومەتی ئیسلامی دەکات کە پڕە لە دادگەریو ئەوەی ستەم و ناخۆشیش بێت لی دادەڕنێت، ئەگەر ئەمڕۆ بێتە داوەرو سەیری ئەو بابەتە پێشکەش کراوانەی ئەوڕۆ (ئەوەی ماوەیەکە نووسراوە) بکەی ئەم راستییەت بە جوانی بەرچاو دەکەوێ،

شاهێدی دەدات لە سەر ئەو فیكرە وشكە میسالیە، ئەمە لە كوێ‌و ئەو هزرە ئیسلامیە پاكەی سەدەی یەكەم لە كوێ، كاتێ واقعی ژیانی دەكردە خاڵی دەست پێكردنی توێژینەوەكانی‌و ئازارو چارەسەرەكانی دەست نیشان دەكرد، پەنجەیان دەخستە سەر نەخۆشیەكان‌و دواتر لە سەر بنەمای شەریعەتی ئیسلامی چارەسەری گونجاویان بۆ دیاری دەكرد، پلە پلە لەو بارودۆخەوە دەیان برد بەرەو چاكترین‌و بەرەو شارستانیەیی‌و ئاوەدانی. لەبەر ئەوەی هزری ئیسلامی میسالی بووە (وەك پێشتر باسمان كرد) گومانی تێدا نییە كە لە برێتی ئەوەی هۆكاری یەك بوون بێت بوتە هۆكاری پەرتەوازەی‌و لە دایك بوونی ئەو پارت‌و رێكخراوە ئیسلامیانە، ئەو خەڵكانەش كاتێ سەرگەرمی حزبایەتی دەبن ئەو دەم هەژار دەبن، لە پسپۆڕی‌و واقیع بینانەوە دەبنە كەسانێ كە مامەڵەیان میسالی‌و لە ئاستی پێوستدا نابن، ئەو كاتیش دەبنە دەستە دەستە و هەریەكە ئاوی دۆڵێ دەخۆنەوەو هەركام ئەوی تر تاوانبار دەكات وەك ئەوەی ئەورۆ دەبینرێ لە هەڵوێست بەرامبەر قەیرانی كەنداو.

دەكرێ ئەوەش زیاد بكرێ لەو دیاردانەی كەبوونەتە هۆی كەلێن دروستكردن لە هزری ئیسلامیدا، بەهەمان پەیڕەوی شیكاری لە ئاكاری بە دووكەوتن‌و رێكردن لە سەر هەمان ڕێ لە برێتی رەخنەو بەراوركردن؟ وەئاكاری خودی لە برێتی بابەتگەرایی، ئەگەر سەرنجێ بدەین لە ڕێبازی زۆرینە لە بیركردنەوەی موسڵمانان دەبینین ئەو دووانە دوو سیفات‌و ئاكاری دیارو زاڵن، كە ئەوانیش دەبنە هۆكاری پەرتەوازیی‌و چەند دەستەیی.

**ج ـ دیكتاتۆریی وەك هۆكارێكی پەرتەوازەیی هزریی:**

پێشتر ئاماژەمان كرد كە بنەما عەقیدەییەكانن كە تایبەتمەندیە پەیڕەوییەكانی هزری ئیسلامی دیاری دەكەن، ئەوەتا ئەمڕۆش عەقیدەی ئیسلامی لە نێو موسڵماناندا هەیە، ئەی (چیە) نەبۆتە هۆكاری دروست بوونی ئەو تایبەتمەندییە یەكبووانەی هزری ئیسلامی؟ پێدەچێت بنەماكانی عەقیدەی

ئیسلامە هێندە پاك وەرنەگیرابن یا كاریان لە سەر دەرونی تاكەكان نەكردبێت بەوشێوەیەی ببنە هۆكاری دروست كردنی هزری یەكبوو، ئەمە بەشێكە لە هۆكارەكە، هۆكاری گەورە بەبیروبۆچۆنی ئێمە، نەبوونی ئازادی رادەربڕینە وەك پێشتر ئاماژەمان پێكرد، ئەو بزوێنەرە پێویستە كە دەبێتە هۆی دروست كردنی ئاكاری دروستكەری یەكبوونی هزری لە ناوچەی لە باری هەروەك عەقیدەی ئیسلامی ئامادەی دەركەوتنی و چالاكی كردووە، بۆ پیادەبوونی یەكبوونی هزری كرداری بە پێویستی نازانم ئەوە تایبەت بكەم كە ئەمڕۆ لە ژیانی موسڵماناندا دیكتاتۆری بەربڵاوە، چونكە ئەوەیان دیاردەیەكی بەرچاو ڕوونەو پێویست بە سەلماندنو هێما بۆ كردن ناكەن، بەڵام دەمانەوێ ئەوە روونبكەینەوە كە دیاردەی دیكتاتۆریو خنكاندنی ئازادی ڕادەربرین لە گەلەك بواردا بۆتە هۆی فرە هزری نێوان موسڵمانانو هەڵوەشاندنەوەی ئەو ئاكارانەی كە وەك رایەڵی یەكبوونن. دیكتاتۆریو جەوری سیاسی كە دیاترین شێوازی دیكتاتۆریو ستەمە لە مرۆداو ئازادی رادەربڕینی خنكاندووە، لە ئاستی دەربڕینی دیدگاو بۆچونانەی كە دەبنە هۆی چارەسەركردنی كێشە گشتیەكانی ئومەت لە باسكردنی هۆكارەكانی، وە ئاشكراكردنو دیاریكردنی رێچارەكان، وە بەرەنگاری كردن لەو دیدوبۆچونانەوە نەرێ دەربڕین بەرامبەر ئەو شتانەی كە لەلایەنە فەرمیەكانەوە دەردەبڕدرێن. زۆرجار جەوی سیاسی ئەوە تێدەپەرێنێ كە نایەڵێ ئازادانە رادەربردرێ بۆ بەكار بردنی زەبرو زەنگ دژ بەوانەی كە بە شێوەیەك لە شێوەكان توانیویەتی راكانی دەربڕێ.

ئەوەش شتێكی ئاساییە لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا، كە لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر جیاوازە، بەڵام هەمووی وەك یەك وایە، ئەم جەوە سیاسییە كە ئازادی رادەربڕینی مراندووە، عەقڵەكانی وەرگەڕاندووە لە تێڕوانینی رووداوەكانی رۆژ كە لە ژیانی موسڵماناندا دەگوزەرێ بۆ بیركردنەوە لە هۆكارو رێچارەكان، بە دوری خستۆتەتەوە بە پەكخستن، بە زۆرو ملهوڕی، ئەم عەقڵانەش لە قۆزیاغەی خۆدا

دامرکانەوەو ڕۆچو لە میسالیەتدا کە ئەمەش بویە ئاستەنگی بەردەم واقع بینی، ئەمەش بۆتە هۆی پەیدا بونی خاسیەتێکی وەك خۆبینیو میسالیەت لە تێڕوانیدا، ئەوەش بە جوانی لە نێو ئەو لاوانەدا بەدی دەکرێ کە دوی سۆسیالیزمی کەوتونو کلاوی با بردوویان بردونی بەرەو بەدیهێنانی یەکسانیەکی رەها، هەروەها لە نێو ئەو لاوانەشدا بەدی دەکرێ کە تازە بەرەو لای پەروەردگاریان گەڕاونەتەوەو چاوەڕێی رامکردنی ژیانی کۆمەلایەتی بون لە سەر بنەمای ئاکارو رەوشتی بەرزی ئاینی، بەلام لەمپەر دروستکردن لە بەردەم ئازادبوونیدا وای لێکردوە تەنها لە خودی خۆیدا بژیو هەموو تواناو بەهرەکانی بێهودە تیا بباتو مامەڵەی لەگەڵ رووداوەکاندا مامەڵەیەکی سەقەتو خواردەبێت، ئەو دەم هەڵوێستەکانیشی ناواقعی دەبنو دادوەریشی لە سەر رووداوەکان ناتەندورست دەبێ، هەروەها رێچارەکانیشی بۆ کێشەکان رێچارەی خوارو خێچ دەبن، چونکە ئەو رێچارانەی هەڵیان دەرێژێ لە چوار دیوارەی میسالیەتەوە سەر دەردێننو لە ئاستی پێویستدا نین، کە ئەمەش وادەکات ئەو هەوڵە چاکسازییانەی دەیدات بۆ گرفتەکانی ئومەت نەگونجێن لەگەڵ ئەو واقعەی ئومەتی تێدا دەژی، ئەمەش شێوازو ئاکاری هەرگروپو کەسێکە کە ئازادی رادەربرینی لێزەوت کراوە، ئازادانە بیرناکاتەوە لە واقعی موسڵمانانداⁱ لە بواری پەروەردەشدا ستەمو بێدادیەك بەدی دەکرێ، خۆی لەو هەڵوێستانەدا دەبینێتەوە کە زۆرێك لە دامو دەزگا پەروەردەییەکان دەی نوێنن لە هەڵبژاردنی هەڵەی مادەی زانستی دا کە دەیبەخشنە بواری پەروەردەو فێرکردن، کە دەبێتە هۆی کپکردنی هزروبیری نەجەوانانو ئەستاندنەوەی مافی سروشتی خۆیان لە ئازاد بوون بەرامبەر بە

---

[1] بۆ ئەمە بگەڕێوە بۆ مێزگردێکی زانستی گرنگ کە کۆمەڵە زانایەکی بە توانا بەشدارییان تێدا کرد سەبارەت بە (لاوانی رابوونی ئیسلامیی تاوانبارن بە قوربانی) لە رۆژنامەی (المسلمون) ژمارە (٢٩٨و ٢٩٩ (٨/١) ربیع الآخر ١٤١١/ ١٩ـ ٦ اکتوبر ـ تشرینی یەکەم ١٩٩٠ بلاوکراوەتەوە.

ئاگایی سەبارەت بە داهێنراوە مەعریفیەکان لەگەڵ ڕێنمونی راستو تەندروست لەو بوارەدا، هەروەها زۆرێك لە دامەزراوە پەروەردەییەکان پەیڕەوێکی هەڵەیان هەیە وەك بە گوێدادانو شوێنکەوتنی کوێرانە کە ئازادی رادەربڕین زەوت دەکرێو بوار بە کەس نادرێ قسەی تیا بکاتو راو بۆچوونی خۆیی تێدا دەربڕێ. ئەمەش تایبەتی قۆناغو تەمەنێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو وای لێهاتووە خەریکە دەبێتە دیاردە[1].

بەم چاودێریو ئاستەنگ دروست کردنە لە بواری پەروەردەدا، ئەم زەوتکردنەی ئازادی رادەربڕینە وا دەکات سیفاتی نەوەکانی داهاتوش دێرخوێندنەوەو بەر تەسك بێت، تەنها لە یەك گۆشەوە دەڕواننە ڕێچارەی کێشەکان، ئەو دەمەش تێڕوانینی ڕەخنەگرانەیان لا هەڵدەگیرێ کە دەبێتە دەروازەی گەیشتن بە رای جیاوازو دەرئەنجامی پێچەوانە، ئەو دەمارگیرییەی ئەمڕۆ موسڵمانان رووبەڕووی بوونەتەوەو دامەنگیری زۆرێك لە گروپەکان بووە، دەرئەنجامی ئەو بیرکردنەوە تەسکەهێڵ بۆ راکێشراوەیە کە وەریان گرتووەو ئەمڕۆ بەرهەمو بەروبومی تاڵی دەچێژین[2]، یەکێکی تر لە بەرهەمە تاڵەکانی ئەوەیە دەبینین لە سەر زۆری لەو بێئاگایانەی کە بێ یەكو دوو راو بۆچوون لە سەرووی خۆیان وەردەگرنو راو بۆچوونەکانیان لەسەر ئەوانە بینا دەکەن وەکو ئەوە وایە لەسەر بناغەیەکی داڕوخاو بینا کرابن. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ

---

[1] لە گەشتێکی زانستیدا بۆ کۆلێژێك (کۆلێژەکانی(الدعوە) لە زانکۆیەکی عەرەبی ئیسلامیدا، ئەوەمان تێبینی کرد کە لە مەنهەجی خوێندنیاندا توێژینەوە ناکرێ، یا وانەیەك نییە سەبارەت بە ئاینزا فەلسەفییە کۆنو نوێکان کە دژی ئیسلامنو پێویستی بانگبەرن بۆ وەستان لەسەریانو ناسینینانو پەرچدانەوەیان، پرسیارمان لە راگری کۆلێژ کرد لەوەلامدا وتی: مەبەستی کۆلێژ ناساندنی هەقە بە قوتابی، ئەودەم خۆی شتە پووچو بەتاڵەکان دەزانێ و چۆنایەتی بانگەوزایش فێر دەبێت.

[2] بگەڕێوە بۆ محمد الغزالي ـ دستور الوحدة الثقافية بين المسلمين، ٥٤و دواتر.

ونبوونی ئەو کاری رەخنەو پاڵفتە کردن لە پێناو جوداکردنەوەی بەهێز لە لاوازو راستو دروست لە هەڵەو نادروست.

دیتر پەروەردەی بەگوێدادانو ملکەچکردنو مراندنی راو بۆچوون بەرهەمەکەی لەوە زیاتر دەبێت چی دەبێت؟ دەوری تاکرەویو تاکڕایی زۆریٚ لە بزاڤە ئیسلامیەکانیشی گرتۆتەوە، ئەمانیش بە شێوەیەك لە شێوەکان ئازادی رادەربرینیان کورتکردوەو بوار نادەن بە دواکەوتوانیان ئازادانە بحوێننو بخوێنینەوە، بەڵکو هێڵکیان بۆ دەکێشنو چەند مادەیەکی مەعریفیو رۆشنیرکردنیان بۆ دەست نیشان دەکەنو ئەوانیش لە نوسراوی چەند کەسانێکی دیاریکراو لە نوسەرو رۆشنبیر، وە ڕادەربڕینیان تەواو تەسك کردۆتەوەو بواری پەیڤینو وتووێژ لەسەری بەناوی پیادەکردنی مەبەستەکانی گوێدێریو گەردن کەچیو گوێرایەڵی. ئەمانەش هەمووی کۆمەڵە ئاسەوارێکی خراپیان هەبوو لە سەر خاسیەتی ئەو فکرەی لە سەر پەروەردە بوون، کە زۆرێکیان ژیانیان لە چوارچێوەی چواردیوارێکی بەر تەسکی میسالیو لاپەرەی چەند نووسراوێكو بیری رووکەش لە مامەڵە کردنی مەعریفاندا لەگەڵ کێشەکاندا کە دەخرێنە بەردەم بۆ باسو لێکۆڵینەوە لە سەر ئەم هێڵە.

لە سەر ئەم هێڵە دەتوانین دیاردەکانی زۆرداری و ستەم لە واقعی ئیسلامییدا دەست نیشان بکەین، هەروەها پەنجە بخەینە سەر ئەو بوارە بەرفراوانەی کە بوتە هۆی کپکردنی راکان و مراندنی و ئەو دەرئەنجامەی کە لێیکەوتۆتەوە لەو پەرتەوازە بونەی فکری ئیسلامی بەهۆی لەدەستدانی تایبەتمەندییە مەنهەجییەکانی کە هۆکاری یەکبونەکەن، تەنانەت دەشتوانریٚ بە بەدواداچوونی هەرکام لەو کەلێنانە پەنجە بخرێتە سەر هۆکاری دروست بونی کێشمە کێشەکانو گرفتەکانی واقعی ئیسلامی، لێرەوە دەمانەویٚ وێنەیەکی بەرامبەر بەو بکێشینو ئەوە روونبکەینەوە کە چۆن دەکریٚ واقعی ئیسلامی ئەمڕۆ بەهۆی ئازادی رادەربرینەوە یەکبوونو یەکگرتویی بگێڕێنەوە ناو موسڵمانان کە ئەمەش ببێتە هۆی دروست بونی یەکبونێکی کولتوری سیاسیی جموجوڵو ئاینڕایی لە نێوانیاندا.

## ٢ ـ ئازادیی رادەربڕین و یەکبوونی کلتووریی:

مەبەستمان بە یەکبونی کەلتوری نێوان ئومەت، یەك شێوازیە لە دروست کردنو بنیادنانی ژیاندا لە سەر هەردوو ئاستی تیوریو پراکتیکی، ئومەتی یەك کەلتوری ئەو ئومەتەیە کە نەوەکانی لەسەر یەك شێواز یەکدەگرن، یا نزیك لە یەکن لە چارەسەرکردنی بیردۆزیانەی کێشەکان، و ئەنجامدانی پراکتیزی ژیان وەك رێسایەکی بەرێوەبەریو ئابوریو ئاوەدانی و هونەرو پەیوەندی کۆمەڵایەتیو باو نەریتو ئەو ئومەتەی لە رووی کەلتورەوە پەرتەوازە ئەو ئومەتەیە هەر کەس بۆخۆی شێوازێکی تایبەت بە خۆی هەیە[1]. رۆشنبیری ئیسلامی، یا دەستەبەرکردنی ژیان بە شێوازێکی ئیسلامی دروست نابیت تا ئەم دوو خاڵە نەبنە بنەما بۆی یەك بەها ئیسلامیە تایبەتییەکان لە عەقیدەو شەریعەو ئاکار دوو هۆکارە گۆڕاوەکان لەگەڵ گۆرانی باروودۆخداو هۆکاری پێدەکردنی ئەو بەها ئیسلامیە نەگۆرانە، ئەوانیش هۆکارێکن بە دەست نایێن تالە رودا لەتوانای مرۆڤ وەرنگیریَ لە مەعریفەتی تیوریو پراکتیزی. هەرکات موسڵمانان ژیانیان لە سەر رەگەزی یەکەم بیناکرد، بەڵام رەگەزی دوهەمیان پشتگوێ خست ئەو دەم رۆشنبیریەکی دواکەوتوی داکەوتویان دەبێت. هەر کاتیش رەگەزی دوهەم بکەنە خاڵی دەستپێكو یەکەم پشتگوێ بخەن ئەو دەم رۆشنبیریەکی گومڕایان دەبێت یا سەرلێشێواو، رۆشنبیری ئیسلامی راستین ئەو رۆشنبیرییە هەردوو رەگەزی بەهائاییینە نەگۆڕەکەو ژیان لە واقعدا یەکانگیردەبن.

بەم پێیە یەکبونی رۆشنبیری نێوان موسڵمانان نایێتە دی تا یەك شێواز نەبن لە پیادەکردنی ژیانیانداو ئەو دوو رەگەزە پیادە نەکەن. ئەم شێوازە یەکبوە

---

[1] بۆ چمکی رۆشنبیری و یەکبوونی رۆشنبیری بگەڕێوە بۆ مالك بن نبی مشكلة الثقافة، ئەمەش نایابترین نووسراوە لەم بوارەدا لە کاتێکدا چمکی رۆشنبیری خامەکان تێیدا زۆر جیاو پەرتەوازەن، بەڵام ئەم بە جوانترین شێواز لێکی داوەتەوە.

کاتیێ دێته جێ کەشوهەوایەك دروست بکرێت کە توانای ئازادی رادەربرینی تێدا هەبێو عەقڵو هزرەکانیش کراوە بنو واقعیانە مامەڵەی بکەن لەگەڵ بەها نەگۆرو چەسپاوە ئاینیەکانو بە هەند وەرگرتنی زانستە مەعریفیە مرۆییەکانو هەموو کۆتو زنجیرێکی سەرعەقڵو ژێری هەڵبگیرێ.

کرانەوەی هزر لە سەر رەگەزی یەکەم وەدەستەبەر دەبێ بەرووکردنە توێژینەوەو خوێندنەوەی بەهاو بنەماو حوکمە ئاینیەکان لە سەرچاوە سەرەکیەکەیەوە کە قورئانەو فەرمودەیە، دواتر خوێندنەوەی ژیارو شارستانێتی ئیسلامی کە راڤەکەرو روونکەرەوەی ئەو بەهاو بنەمایانەو، پیادەکەری رێنمونیەکان بۆ ئەرزی واقعو ئەزمونگەلێکی بەپیت، کە هیچکات لە هیچ زەمەنێدا موسڵمانان لێی بێنیاز نابن، ئەم خوێندنەوەش دەبێت هەموو ئانیراکان لە خۆ بگرێت بەبێ هەڵاودێرانی هیچ یەك لەوانە. بەمەش هزری ئیسلامی مادەیەکی تەواوی بێکەمو کورت وەردەگرێ لە رەگەزی یەکەم لە رەگەزەکانی رۆشنبیری ئیسلامی بەبێ سنوردارکردنو زەوتکردنی ئازادی، وە کرانەوەی عەقڵیش لە سەر رەگەزی دووهەم توێژینەوەو خوێندنەوەی شارستانی رۆژئاوایە لەوەی ئەمڕۆ چڵەپۆپەی مەعریفیەتی دەستهاتوی مرۆڤە، هەڵقوڵاوی رەگو ریشەیەکی ئاینی فەلسەفی گشتیە، ئەمەش بە خوێندنەوەی هەموو ئاینڕا فەلسەفیە جیاوازەکانو رەوتە ئاینیەکانو یاساو رێسا سیاسیو ئابووریو دیاردە کۆمەڵایەتیو واقعی مرۆڤایەتیە. ئەو زانستە بونەوەریانە لە رەهەندە فەلسەفیەکانیانەوە بە شێوەیەکی تایبەت. تا هەموو لایەنەکانی ئەم شارستانێتیە ببێتە مادەو کەرەسەی توێژینەوە بەبێ لادانو پشتگوێ خستنی هیچ بەشو لایەکی . بەمەش هزری ئیسلامی توانی ئەو دەرئەنجامانە بخوێنێتەوە کە مرۆڤ لەمڕۆدا بە دەستی هێناوە لە هەموو رەهەندەکانیەوە کە ئەمەش رەگەزی دووهەمی بنیادنانی رۆشنبیری ئیسلامیدا.

تەنها ئازادکردنی هزر بۆ کرانەوە بەرووی ئەو ئەنجامو دەستهێنراوانە بەس نییە بۆ رۆشنبیربوونی تاکی موسڵمانو ئازاد بکرێتەوە بۆ تێڕوانینی رەخنە گرانە لە سەر دەرئەنجامەکانی هەردوو رەگەزەکە بە یەکسانی، سەبارەت بە دەرئەنجامەکانی رەگەزی یەکەم، تێڕوانینی رەخنەگرانە بە کردنەوەی بواری هەڵێنجان لە تێگەیشتنو بڕیاردانی حوکمەکان یا داهێنانی کۆمەڵە حوکمێکی تازە لە سەر بنەمای رێساو یاسای گشتیو ئەو بارودۆخەی موسڵمانانی تێدان لە رێچارەی شەرعیی بۆ ئەو کێشە شەرعییە تازانەی کە لەوەوپێش نەبوون، هەروەها تێڕوانینی رەخنەگرانە سەبارەت بە ئاینراکان بە شیکردنەوەی ئاینراکانو پشکنینو بەراوردکردن بۆ هەڵبژاردنی گونجاوترو راسیتر لەگەڵ ئەو هەلومەرجەی ئێستەی موسڵماناندا، دەروازەی هەموو ئەمانەش چوارچێوەی ئازادی هەڵێنجانو ئیجتیهادە.

ئەم ئازادیە لە تێڕوانینی رەخنەگرانە لەسەر دەرئەنجامە ئاینیەکانو ئاینراکان تەنها فاکتەرێکە کە موسڵمانانی ئەمڕۆ یەکدەخات بۆ بەدەستهێنانی ژیانی کە بە چەندین ئاستەنگی جۆراو جۆردا گوزەر دەکات، بەڵام مت بوون لە سەر ئەو کەلەپوورە کە چارەسەرکەری گرفتەکانی رابووردوو بوەو هێنانی بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی ئەمڕۆ وا لە موسڵمانان دەکات بکەونە ناو داوی رێچارەکانی یاسا دەستکردەکانی ئەمڕۆ، کە ئەمەش هۆکارەکەی دەگەرێتەوە بۆ کپکردنو مراندنی ئازادی هەڵێنجانو تێڕوانینی رەخنە گرانە بۆ ئەو کەلەپورە.

ئازادی تێروانینی رەخنە گرانە بۆ دەرئەنجامەکانی رەگەزی دووهەم ، ئەویش بە دەست هێنانی مەعریفەتی مرۆیی، ئەمەیان دەبێت ببێتە هۆکاری دروست بوونی بزاڤێکی رەخنە گرانەی بەرفراوان بۆ ئەم مەعریفانەی بە دەستهێنراوان، کەوا بکات هەق لە بەتاڵ جودا بکاتەوە لە خودی خۆیدا بە بەڵگەی عەقڵو ئاسەواری ژیانی تاکو کۆمەڵ، هەروەها دەبێت بێتە هۆی جوداکردنەوەی ئەوەی راستە لە زانستە بوونەوەریەکانو مرۆییەکان یا بە رێنموونی کردنی ئەوەی

پەیوەندیی بە رەهەندی رۆشنبیری‌و ئایدیۆلوژیە، چونکە ئەو رەهەندانە بەشێکی جودانەبووی ئەنجامی ئەو زانستانەن، بیردۆزی پەرەپێدان نمونەیەکی روونی ئەو راستیەن، ئەم بزاڤە رەخنە گرانە وادەکات ئەوەی پێچەوانەی بەها ئاینیەکان بێت دوری دەخاتەوە، هەروەها ئەوەی جێی پرسیارەو نادیاری رێنمونی دەکات‌و راستی دەکاتەوە، ئەوەشی کە هاوڕای ئاینە وەریدەگری‌و دەیکاتە کەرەستەی بنیادنانی پەیکەرێکی یەکبوونی رۆشنبیری ئیسلامی.

نەبوونی ئەم بزاڤە رەخنەگرانە دەبێتە هۆی پەرتبوونی موسڵمانان‌و دژە هەڵوێست بەرامبەر ئەو زانست‌و مەعریفەتە مرۆییانە، ئەو دەم تەنها لە چوارچێوەی دیواری کەلەپوری داخراودا دەژین. ئەگەر بێتو لەگەڵ کەلەپوردا مامەڵەیەکی کراوەیی رەخنەگرانە بکەین‌و هەمان مامەڵەشمان لەگەڵ زانست‌و مەعریفەتە مرۆییەکان بێ وادەکات کە ئەوانەی لە رۆژئاوا دەژین بە چاوی کراوەو سەیری کەلەپورو مێژووی زێرینمان بکەن. ئەوانەش کە پشتیان بە کەلەپور بەستوە بە هەمان شیوە سەیری زانست‌و مەعریفەتە مرۆییەکان بکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی روگەیەکی یەکبوو هەموان لە شێوازێکی تایبەتدا یەك دەگرنەوە، بنەمایەك‌و بناغەیەك دادەرێژن لە سەر بەها جێگیرە ئاینیەکان‌و بەهێزکردنیان ئەوەی کەراست‌و دروستە لە دەستهێنراوە مرۆییەکان، ئەو دەمەش ژیان رێنمونی دەکەن بە ئاڕاستەیەکی راست‌و دروست.

## ٣ ـ ئازادیی رادەربڕین و یەکبوونی مەزهەبیی:

موسڵمانان لایەنگیری چەندین ئاینرایی فقهی‌و عەقیدەین، گرنگترینیان لە بواری فقیهدا ئەمرۆ چوارن "حەنەفی، شافعی، مالکی، حەبنەلی" لە بواری عەقیدەشدا سیانن "سوننە، شیعە، ئیبازیە" ، ئەم ئینتمایە لە هەندێ شوێن‌و لای هەندێ کەس هێندە رۆچونی تێدایە بۆتە هۆی پەرتەوازەیی، دیارترین نموونەشی ئەو دووبەرەکیەیە کە لە نێوان سوننەو شیعەدایە، یەکبوونی ئاینڕایی دوو پلەیە:

**یەکەم:** یەکبوونی موسڵمانانو یەکگرتنیان لە سەر یەك ئاینرا کە هەڵقوڵاو هەڵێنجراوی هەموو ئاینراکان بێتو پشت ئەستور بێت بە بەڵگەی قورئانو سوننەت.

**دووەم:** موسڵمانان هەرکام لە سەر ئاینڕای خۆی بێت، بەڵام لە یەك نزیك بنەوە لە زۆرێك لەو شتانەی کە دەکرێ نزیك بن تێیدا. لە تایبەتمەندییەکانی ئاینڕاکەشیاندا هەرکام بۆ خۆی بژی، بە مەرجی وەلانانی دیاردەی دژایەتیو پێکدادان. ئەگەر یەکبوون لە ئاستی پلەی یەکەمدا دوورەو لەمڕۆدا نەگونجاو بێت بە تایبەت لە سەر ئاستی عەقیدە، بەڵام پلەی دووهەمی گونجاوەو دەکرێ بێتە دی، هەرکات ئەمەی دووهەمیان بێتە دی دەبێتە هەنگاوێك بۆ گەیشتن بە پلەی یەکەم، مەزهەبیەت بە هەردوو شێوەکەی دەرهاوێشتەی مێژوویەکی کۆنە، مەزهەب لە راستیدا روکاری جیاوازی ئاینداری کردنە، لە رووی ئیمانو عەقیدەو ئاکاری شەرعیەوە، کۆشینە بەمەبەستی چۆنایەتی ئاینداری کردن. کاردانەوەی دەقەکانی شەرع لەگەڵ ئەو بارودۆخەی کە بە ژیانی موسڵماناندا تێپەڕیوە لەودەمەی هاتۆتە خوارێ تابە ئەمڕۆ، وێڕای ئەوەش ئەو ئاینڕایانە پەیوەندیەکی بەهێزیان بەو واقعەوە هەبووە کە تێدا هاتوونەتە دی، بەڵام شوێنکەوتوانیان هێناونیانو لەگەڵ هەمووئەو گۆڕانکاریە مێژوویانەی بە سەر ژیاندا هاتون وەك خۆیان مامەڵەیان لەگەلدا کردوون. (مەزهەبیەت) ڕۆڵی کاریگەرو بەهێزی هەبووە لە دەوڵەمەندکردنی بواری کۆشینو بەرفراوانکردنی ئەزموونی ئیسلامی لە دینداری کردندا، کە ئەمەش بۆتە هۆی دروستکردنی کتێبخانەیەکی گەورەو دەوڵەمەند لە بواری فقهو عەقیدەدا، کە لای هیچ ئومەتو نەتەوەیەك هاوشێوەی نییە. لەم لایەنەوە گەنجیەنەیەکی گرانمایەی گەورەی بەدیهێنا کە هیچ نەوەیەك لە نەوەکان بێنیاز نابێ لێی، نەك هەر ئەمە، بەڵکو کەلەپوورێکی مرۆییەو سەرچاوەیەکی بەهێزە بۆ مەعریفەتی مرۆیش.

وێڕای ئەوەش، ئەمە نابێتە بیانوو پاساوێکی عەقڵی کە هەنوکەش موسڵمانان لە سەر ئەو بیرو بۆچوونە بەرتەسکە بژینو هێندە توندڕەو بنو لە زۆرکاتو شوێندا ببێتە هۆی پێکدادانو گێرە و کێشەنانەوە، لە کاتێکدا یەکبوونی ئومەتو پاراستنی یەکریزی یەکێکە لە مەبەستە سەرەکیەکانی ئاین، مەزهەبیەت بەم شێوازە جۆرێکە لە تێوەئالاّن بە کۆشینە پێشینەکان، کە زادەو هەڵقولاّوی بارودۆخێکی تایبەت بوون کە ئەمڕۆ بە تەواوی گۆڕاوەو پێچەوانەی ئەو کاتەیە، ئەوەش بەهۆی کپکردنی ئازادیەوە ڕێدەکات، لەبەرئەوە بۆ ڕەهابوون لەو حاڵەتە نەخوازراوە پێویستمان بە بزاڤێکی بەرفراوان هەیە لە بواری ئیجتیهادا، کە لە سەر بنەمای ئازادی رادەربرین بێت لە هەردوو بواری عەقیدەو فقهدا، لە بواری عەقیدەو مەزهەبی سوننەو شیعەو ئیبازیە لە بارودۆخێکی تایبەت ئاژاوەو فیتنەدا لە سەدەی یەکەمدا هاتنە گۆڕێ، وەڕایەڵەکانی لە سەر گفتوگۆو پەیڤینی ناو خۆی بنیاد نراون. هەروەها لە دەرئەنجامی ئەو گفتوگۆیەوە کەلەگەڵ ئاینڕاو کلتورە دەرەکیەکاندا روویدا.

ئەو بارودۆخ و رووداوانە کۆمەڵە بابەتێکی دیارکراو و کۆمەڵە شێوازێکی گونجاوی ئەو دەمەی دەخواست، کە بوونەتە تەوەرەی بنچینەیی ئەو ئاینڕایانە. لەوانە بابەتی "زاتی خوای گەورە لەگەڵ سیفاتی خوای گەورەدا" وە کەلامی خوای گەورە لە نێوان "قدم" و "حدوث"دا، وە سیفاتە خەبەریەکانی خوای گەورە لە نێوان جائز بوونو مەحاڵ بووندا، وە بینینی خوای گەورە لە نێوان رەوابوونو رەوانەبووندا[1]. ئەمانە هەموویان زادەی بارودۆخێکی تایبەتو هەلومەرجێکی کاتی بوون. ئایا ئەمڕۆ ئەو هەلومەرجو کاتە ماوە کە موسڵمانان ئاواهی سەرگەردانو پەرتەوازە بژین بە هۆی ئیجتهادی زەمەنێکی رابوردوو هەلومەرجێکی کاتی؟ پێمان وایە دەبێت عەقڵەکان رەها بکەین لەو کۆتو زنجیرە

[1] بگەڕیوە بۆ توێژینەوەیەکمان (دور الفکر الاسلامي في نصرة العقيدة بين الأمس واليوم) گۆڤاری کۆلێژی زەیتونە / تونس ژمارە (٥).

مەزهەبیانەو ڕێنمونی بکەین‌و ئازادی پێببەخشین بۆ چارەسەرکردنی واقعی ئەمڕۆ، کە خۆی لە ڕووبەڕووبوونەوەی نوێ دەبینێتەوە کە عەقیدەی ئیسلامی بە نیشانە کردووە. ئەگەر عەقلی موسڵمان ئاڕاستە بکرێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم بەرەنگاریە کە مادیەکان لێیان گرتووە بەشێوازی جوداو جیاواز ئەو دەم موسڵمانان خۆیان لەبەرەیەکی یەکبوودا دەبینێتەوە کە قورئان و سوننەت دەکەنە خاڵی دەستپێك بۆ ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیەو ڕێسایەکی ئیمانی هاوبەشی دادەڕێژن کە دەبێتە باگراوندی هەموو کۆشینێك‌و لایەنەکانی تری ژیان، بەمەش چوار دیواریەکی هاوبەش بنیاد دەنێن بۆ ژیانی ئیسلامی هاوبەش‌و دەبێتە دەستپێکی نەمانی ئەو مەزهەبیەتە کۆنە، ئم ڕووبەڕووبوونەوەیە دەبێتە هۆی ڕەها بوونی عەقڵی موسڵمان لە پەرتەوازەیی‌و چاولێگەری‌و چاو لە دووبونی دەرهاویشتە مێژووییەکان‌و سەرەتایەك دەبێت بۆ ئاراستەکردنی ئومەت بەرەو یەکبوون‌و یەکریزی.[1]

مەزهەبیەتی فقهیش هەمان شێوەیە، بەڵکو ئاسانترە، چونکە فقه بریتیە لە چارەسەرکردنی لق‌و پۆپەکانی ئایین نەك ڕەگ‌و ریشە. ڕەها بوون لە دەمارگیری فقهی بە ئاڕاستەکردنی دبێت بۆ چاوکرانەوە بەرووی دونیای نوێداو گەڕان بەدوای چارەسەکردنی کێشە هەنوکیەکان، ئەم ئاراستە کردنەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو ئاینرا فقهیانە وەك گەنجینە سەیر بکرێن‌و گرفتەکانی ئەمڕۆ لە سەر بنەما گشتیەکانی ئەو ئاینڕایانە چارەسەر بکرێن. ئەو کات سەرگەرم بوونی موسڵمانان بە واقعەوەو ڕووکردنە ئاینده بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەرامبەر دەبێتە ئیشێکی ڕۆژانەو کەلەپوری رابوردوش دەبێتە سەرچاوە، بەمەش موسڵمانان هەنگاوێکی نوێ دەنێن بەرەو یەکریزی‌و بە دووربوون لەو پەرتەوازیەی هەیە[2].

---

[1] بگەڕێوە بۆ حسن الترابي ـ قضايا الحرة والوحدة.

[2] بگەڕیوە بۆ محمد الغزالي ـ دستور الوحدة الثقافية بين المسلمين، ٥٤و دواتر.

## ٤ ـ ئازادیی رادەربڕین و یەکبوونی سیاسیی:

یەکبون سیاسی نێوان موسڵمانان لە سەر دوو پلەیە وەك یەکبونی مەزهەبی: یەکبونێکی سیاسی هەمە لایەنەو گشتی هەموان لە وڵاتێکی ئیسلامیدا یەکبخات. دووهەم: یەك هەڵوێستی لە چوار چێوەی روداوە ناوخۆییەکانی جەستەی ئومەتی ئیسلامیو ئەو کێشمە کێشانەی کە جیهانی ئەمرۆ تێدا دەژی. یەکبونی سیاسی گشتیو همەلایەنە خواستو مەبەستی یەکەمینی موسڵمانانە، بەڵام لە مرۆدا گەیشتن بەو یەکبونە دورە، بەڵام یەکبونی پلەی دوهەم زۆر ئاستەم نییە، کەدەکرێ بکرێتە خاڵی سەرەتاو دەستپێك بۆ یەکەم.

هۆکارەکانی پەرتەوازبونی سیاسی ئەمڕۆ زۆرێکیان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو دواکەوتوییەی کە دامەنگیری موسڵمانان بووە، هەندێکیشی بە هۆی دەسەڵاتی زۆرەملیو سەپاوی ئیستکباری جیهانیەوەیە. بەشێکیشی دەگەڕێتەوە بۆ دەردی کوشندەی کپکردنی دەنگی ئازادی ئومەتی ئیسلامی کە بە بیانوی یەکپارچەییو دورکەوتنەوە لە پەرتەوازەیی خراوەتە سەریان، بەم پێیە ئازادی رادەربڕین رۆڵێکی گەورەی هەیە لە پێشخستنی یەکبونی ئیسلامی بە هەردوو پلەکەیەوە لە چوارچێوەی هەرێمی ئیسلامیدا، خەفە کردنی سیاسی کە بۆتە هۆی نەهێشتنی ئازادی رادەربرین، رۆژێك دەبێتە بورکانێكو دەتەقێتەوە، نموونەشمان زۆرن لە جیهانی ئیسلامیدا. ئەگەر بوار بە ئازادی رادەربڕین بدرێت، لەگەڵ دیاریکردنی سنووری و چوار چێوەیەکدا، دەبووە هۆی نزیکایەتی گروپو تاقمە سیاسییەکان لە لایەکەوە و پەیوەندی نێوان گەلانو دەسەڵات لە لایەکیترەوە، چونکە ئازادی رادەربرین دەبێتە هۆی دروستکردنی کەشو هەوایەکی لەبار بۆ پەیڤینو گفتوگۆ کردن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی رای گونجاو بۆ بەرێوەبردنی کاروباری ئومەت، ئەم رادەربڕینەش دەبێتە هۆی لێك نزیك بوونەوە، کە گرژیو ئاڵۆزی ناهێڵێ کە بۆتە هۆی کپکردنی دەنگەکان، راوەرگرتنی بەرامبەر شتێکی ئاسایی دەبێت با وەکو لە مەیدانی واقعیشدا جێبەجێ نەکرێ.

بە تێرامان لە حاڵو وەزعی گەلان ئەوە دەردەکەوێ ئەوانەی ئازادی رادەربرینیان فراوانترو زیاترە یەکبوونی سیاسیان بەهێزترە، بەڵام نموونەی زۆر کەمیی هەیە لە نێوان گەلانی ئیسلامیدا کە ئەم راستیەیانە تێدا بەرجەستە بووە،

لە چوار چێوەی ئیسلامدا بە گشتی ئازادی رادەربرین دەبێتە هۆی نزیکبوونەوەی گەلانی موسڵمان لە یەکترو هەنگاوێك بەرەو پێشیدەبات لە سەر رێبازی یەکبوون، لەو هەنگاوە جوراوجۆرانەی کە ئەمڕۆ کپکراوو داخراون، ئەو کپکردنەش هەموو کات هۆکارەکەی دەسەڵات نییە، بەڵکو جاری وادەبێت کەمتەرخەمیە لە بێداری سیاسی ئیسلامیدا.

یەکێ لەم رێبازانە، ئەوەیە ئازادی رادەربرینی سیاسی دەبێتە هۆکاری دەست نیشانکردنی خۆسەپاندنی دەوڵی بە سەر جیهانی ئیسلامیەوە، وە دەرکەوتنی هۆکاری ئایدیۆلۆژیو مێژووییەکان وە دەبنە خالێکی هاوبەش کە راڤەی ئەو رووداوانە بکرێن کە بە سەر جیهانی ئیسلامیدا دێن لێرەو لەوێ، بەمەش رایەکی هاوبەش دروست دەبێت سەبارەت بەو بارودۆخەی هەیەو شوێنگەی ئومەتی ئیسلامی لەو کێشمە کێشانەدا. ئەو دەمەش هەڵوێستەکان ئەگەر یەکیش نەبن نزیك دەبن لە مەڕ چارەسەرکردنی رووداوە جیهانییەکانو کێشە مرۆییەکان بە گشتی لە سەرچاو روونیو ئەوەی کە ئومەتی ئیسلامی یەك دەستەیە بەرامبەر ئەوانیترو لە مەیدانی کێشەو گرفتە جیهانیەکاندا.

ئێمە پێمان وایە بە دڵنیاییەوە ئەگەر ئازادی رادەربرین لە بواری سیاسیدا لە ناو موسڵماناندا کارا بوایە، لە وڵاتە عەرەبیو رۆژهەڵاتی ناڤیندا هەرگیز هەڵوێستی موسڵمانان دژیەك نەدەبوو، بەم ناسۆریە لە ئاستی گەلو دەسەڵاتدا لەو کاتەی ئەم قەیرانە دامەنگیری کەنداو بووە.

یەکێکی تر لەو رێبازانە ئازادی رادەربرینی دەمارگیری ناوچەیی کەم دەکاتەوە لە نێوان وڵاتانی ئیسلامیدا. کە لە سەر حیسابی ئیسلام درێژ کراوەتەوە، ئەوەش بە سنورداربوونە ناوچەییە بەرتەسکەی لە بواری گەشە پێدانو ئاوەدانیو

دەستەبەرکردنی ئاسایشی دەرەکی، ئەمانەش هەمووی تەنها ئینتمای ئیسلامیی دەتوانێ دەستەبەری بێ لە بەر بوونی ئەو توانا بەر فراوانە جیاوازەی کە جیهانی ئیسلامی هەیەتی. ئەوکات ئینتمای ناوچەگەری بەرتەسك دەگۆرێ بۆ ئیسلامی گەورەو بەرفراوان.

بەمەش هەستێکی هاوبەش ئیسلامی دێتە گۆڕێ کە دەبێتە هۆی دروستبوونی یەك هەڵوێستی، ئەو کاتیش نزیك دەبێتەوە لەو یەکبونەی خوازیارین، ئێمە چەندین مینبەری راگەیاندنی ئیسلامی دەبینین کە بانگەشەی دەمارگیری بەرتەسك دەکەنو هیچ ئاسەوارێکی ئیسلامی گشتی تێدا نابینرێ، کۆتو بەندێکی ستەمکارانەش خراوەتە سەر عەقڵی موسڵمان و ناتوانێ دۆخی موسڵمانان ببینێ.

دیتر چۆن دەکرێ هاوسۆزی نێوان موسڵمانان دروست بێت. ئەمەشمان نەبێت چۆن دەگونجێ هۆشیاریەکی هاوبەش بەدی بێنێت لە نێوان موسڵماناندا سەبارەت بە کێشە و گرفتە نێودەوڵەتییەکان، ئازادی رادەربڕینی سیاسی تەنها فاکتەری بەهێزە بۆ چاندنی هەست بە یەکبونی سیاسی نێوان موسڵمانانو هەنگاونانی کردەیی بۆ دروست بوونی یەکبونی یەکجارەکی.

## ٥ ـ ئازادیی رادەربڕین و یەکبوونی بزاڤیی:

بزاڤە ئیسلامییەکان هەڵگری غەمو بەژارەی ئومەتنو ئەوانیش هەردەم خەو بەیەکبوونو یەکریزی ئومەتەوە دەبینن، ئەمانیش دووچاری ئەو دەردانە بوون کە ئومەتی ئیسلامی تووش هاتووە، لەوانە دەردی کوشندەی تاکڕەویو زۆرداری بۆنەتەوە شتێکی سەیر نییە، چونکە ئەم بزووتنەوانە هەڵقوڵاوی ئەو خاکو ئاوەن، هەڵگری ئەو خاسیەتو ئاکارانەی کە لەناو ئەو ئومەتەدا هەن، لە دواکەوتویی، کە چەندین سەدەیە ئەو ئومەتە گیرۆدەی بووە، بەڵام رێژەیەکی کەمتر لە ناویاندا بەدی دەکرێ.

جیهانی ئیسلام بە گشتی چەندین بزاڤو جموجوڵی ئیسلامی تێدان، تەنانەت لەیەك وڵاتی ئیسلامیدا چەندین بزوتنەوەو جموجوڵی ئیسلامی بەدی دەکرێ،

زۆرجاریش پێچەوانەی یەك دەبن لە چوار چێوەو سنوری گشتیدا، تەنانەت لە چوارچێوەی ئیسلامیدا پێچەوانەی یەکن، ئەمەش جارجار دەگاتە ئاژاوەو دژیەك وەستاوە، لە کاتێکدا مەبەستی هەموان گەشتنە بە یەك پارچەییو یەکریزی، بەڵام ئاخۆ هۆکارەکان چی بن؟

پێمانوایە گرنگترینو گەرەوترین هۆکار ئەو پەیڕەوەیە کە بزووتنەوەو جموجوڵە ئیسلامیەکان هەیانە، کە دامەزراوە لە سەر کپکردنی ڕا لە بواری پەروەردەو جموجوڵدا وەك یەك، زۆرێك لە جموجوڵە ئیسلامیەکان لە جیهانی ئیسلامیدا کاردانەوەی ئومەت بون لە نەریێ کردن بەرامبەر دواکەوتوییو چاولێگەی رۆژئاوادا. ئەوەش بویە هیوایەك بۆ دژ وەستانو ئەمڕۆی سك پڕ بەئایندەی باشتر، ئەمەش وای کرد ئەوە بێتە بنەمای کارکردنو جیهاد کردنەکەیانو دروست بوونی خودی بزووتنەوەکانیش لە هەندێ حاڵەتو کاتدا.

دیتر ئەو کات ئەم جموجوڵە ئیسلامیانە ناتوانن دوباڵی پەروەردەو بزاوتن لەخۆبگرێ، ئەمەش وای کرد کەزۆرێك لەو بزوتنەوانە ئازادی لە بواری پەروەردەی فکریدا بەرتەسك بکەنەوە بە نیازی کورت هەڵهێنان لە یەك پەرروەردەیو پێکهێنانی یەکریزیی نێو ئومەت، نەهێشتنی ئازادی لە بواری پەروەردەی حەرەکیدا بە بیانوی پاراستنی ڕێکوپێکی ریزەکانو گوێ دێریو گەردن کەچی کە گونجاوترین بواری مەبەستو ئامانجی بزاڤی ئیسلامییە.

ئەم شێوازە لە پەروەردە کە بواری ئازادی رۆشنبیری گشتی بەرتەسك دەکاتەوەو کرانەوە ناهێڵێ بەروی ئاینڕاو راجیاوازەکان، دەستاودەست کردنی کاروباری بزووتنەوەکە بەرتەسك دەکاتەوە، ئازادی رادەربڕین دەمرێ، ئەمانە هەموان بونە هۆی لێك ترازانی ریزی بزووتنەوە ئیسلامییەکانو پارچە پارچە بوونیان، چونکە کاتێ رای پێچەوانە دروست دەبێت بە هەر هۆیەك لە هۆکان، لای ئەوان شتێ دروست دەبێ، دیتر بەرامبەر چەندین ناوی بۆ دەدۆزنەوە، زۆر توندی سەرزەنشتو لۆمە دەکرێن، وای لێدێ سەر دەکێشێ بۆ دژایەتی کردنو

راوەدونان، ئەم راستیەشمان لە زۆرێك لە جموجوڵە ئیسلامیەكاندا پێشچاو دەكەویَ.

بەم پێیە ئازادی رادەربرین، گەورەترین فاكتەرە بۆئەوەی بزوتنەوە ئیسلامیەكان یەكبونی خودیو گشتی خۆیان بپارێزیَ. ئەم ئازادیە بارمتەیە بۆ ئەوەی تاكەكانیان لە سەر مادەیەكی پەروەردەیی كراوەی بەرفراوان لە سەر ئاینراو ئاراستە جیاوازەكان پەروەردە بكات، كەفیلە بۆ پەروەردە كردنیان لە سەر راوێژ لە هەموو كارو بارێكدا، دەساو دەسكردنی ئازادی لەو كێشانەی دێنە گۆڕیَ بە پێوەری بەڵگەو سەلماندن، هەروەها كەفیلیشە بۆ ئاراستەكردنی عەقڵەكان بۆ جیهانی واقعی بەرفراوان بە چاكو خرابیەوە، وە وەستان لەسەر راستیەكانی، ئەوەش دەكاتە خاڵی سەرەتا بۆ چارەسەركردنی كێشەكان، نەك ئەوەی قەتیس بكریَ لە دونیایەكی میسالیو خەیاڵی دا، تا كاتیَ رووداوێك پێشهات تووشی زیانو ئازار دەبێتو دەبێتە هۆی لێك هەڵوەشانی بزوتنەوە، كاتیَ ئەم پەروەدە ئازادە لە ناو بزووتنەوەی ئیسلامیدا دروست دەبیَ، ئەو كات گفتوگۆ دەبێتە رێبازی بەهێزو جوان بۆ هەڵمژینی هەر هەڵەو لادانو زیادەڕەویو تاوان، ئەو كات دڵە لە خواترسە پاكەكان یەك دەگرن لە سەر خاڵێكی هاوبەش، دیتر لە ریزی بزوتنەوەیەكدا بێت یا لە چوار چێوەی بزوتنەوە جیاكاندا بێت بە گشتی، دنیای خەیاڵ و گریماندا نییە ئەگەر بڵێین ئەو بزووتنەوانەی كە ئازادی ڕادەربرینیان تێدایە یەكبوترین بزووتنەوەو ئەوانەیانن كە یەكریزیو یەكپارچەییان بە هێزەو توندو تۆڵترە. بزووتنەوەی ئیسلامی سودانو تونس نموونەی ئەو راستیەن. پوختەی قسان ئەوە دەبێت ئازادی رادەربرین دەروازەیەكی گرنگە بۆ یەكریزیو یەكبوونی موسڵمانان، ئەویش بەوەی كە بەدی دێنیَ لە عەقڵی موسڵماناندا لە تایبەتمەندی مەنهەجی هاوبەش كە بە یەكگەیشتنو گفتوگۆو راگۆڕینەوە دێتە دی، دەبێتە هۆی نزیكبونەوە لە شیكاریو هۆ هێنانەوەو حوكمدا، دەرئەنجامیش یەكبونی موسڵمانانە لە ئامانجو مەبەستدا بە یەك ئامانج.

قورئانیش رێنمونی کردوین بۆ ئەوەی یەکریزی ئومەت لە رێی ئازادی رادەربرین بپارێزرێن لە فەرمانکردن بە چاکەو رێگری لە خراپە، ئەوەش تەنها رێبازی رزگاریو ئازادیە، خوای گەورە دەفەرمێ: (وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَـئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (آل عمران: ١٠٤ـ ١٠٥).

# سەرچاوەکان:

١ـ إقبال (محمد)، تجديد التفكير الديني في الإسلام، ترجمة عباس محمود، ط. مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة ١٩٦٨. البغدادي (أبو منصور عبدالقاهر بن طاهر، ت ٤٢٩هـ).

٢ـ أصول الدين، ط (مصورة عن طبعة اسطمبول ١٩٢٨)، بيروت ١٩٨٠. البيضاوي (أبو سعيد عبدالله بن عمر، ت٧٩١هـ).

٣ـ أنوار التنزيل وأسرار التأويل، ط، مكتبة الجمهورية العربية، القاهرة (د. ت). الترابي (الدكتور حسن عبدالله).

٤ـ قضايا الحرية والوحدة، ط. الدار السعودية للنشر والتوزيع، جده ١٩٨٧. الجرجاني (علي بن محمد، الشريف، ت٨١٦هـ).

٥ـ التعريفات، ط. مكتبة لبنان (مصورة عن طبعة فلوجل)، بيروت ١٩٨٥. الجويني (إمام الحرمين، محمد بن يوسف، ت٤٧٨هـ).

٦ـ كتاب الإرشاد، ط. مؤسسة الكتب الثقافية، بيروت ١٩٨٥. ابن خلدون (أبو زيد عبدالرحمن بن محمد، ت٨٠٨هـ).

٧ـ المقدمة، ط. الشعب، القاهرة (د. ت). الرازي (فخر الدين، محمد بن عمر، ت ٦٠٦هـ).

٨ـ التفسير الكبير، ط٢، دار الكتب العلمية، طهران (د. ت).

٩ـ محصل أفكار المتقدمين والمتأخرين، ط. دا الكتاب اللبناني بيروت ١٩٨٤. الزمخشري (أبو القاسم محمود بن عمر، ت٥٣٨هـ).

١٠ـ الكشاف عن حقائق التنزيل، ط. دار الفكر، بيروت ١٩٧٧. ابن سينا (أبو علي الحسين بن عبد الله، ت٤٢٨هـ).

١١ـ الإشارات والتنبهات، تحقيق سليمان دنيا، ط. الحلبـي، القاهرة ١٩٤٧. طاش كبرى زاده (احمد بن مصطفى ت٩٦٨).

١٢ـ مصباح السعادة، ومصباح السيادة، د. دار الكتب الحديثة، القاهرة ١٩٦٨. ابن عاشور (الشيخ محمد الطاهر، ت١٩٧٣).

١٣ـ تفسير التحرير والتنوير، د. الدار التونسية للنشر، تونس ١٩٨٤. الغزالي (محمد بن محمد، ت٥٠٥هـ).

١٤ـ تهافت الفلاسفة، ط٥، دار المعارف، القاهرة ١٩٧٢. الغزالي (الشيخ محمد).

١٥ـ دستور الوحدة الثقافية بين المسلمين، د. دار الأنصار، القاهرة ١٩٨١. اللّقاني (عبدالسلام بن ابراهيم).

١٦ـ شرح جوهرة التوحيد، ط٢، مطبعة السعادة، مصر ١٩٥٥. مالك بن نبـي.

١٧ـ مشكلة الثقافة، د. دار الفكر، دمشق ١٩٧٩. محمد عبده (الشيخ الإمام، ت١٩٠٥).

١٨ـ رسالة التوحيد، ط٥، دار إحياء العلوم، بيروت ١٩٨٥. محمد التومي.

١٩ـ المجتمع الإنساني في القرآن الكريم، د. الدار التونسية للنشر، تونس ١٩٨٦. محمد يوسف مصطفى.

٢٠ـ حرية الرأي في الإسلام، ط. مكتب غريب، القاهرة ١٩٨٩. المقدسي (مطهر بن طاهر، ت٥٠٧هـ).

٢١ـ البدء والتأريخ، ط مصورة مكتبة الثقافة الدينية، القاهرة (د.ت). النجار (عبدالمجيد عمر).

٢٢ـ فقه التديّن فهماً وتنزيلاً، ط. الأمة، قطر ١٩٨٩. ٢٣ـ خلافة الإنسان بين الوحي والعقل، د. دار الغرب الإسلامي، بيروت ١٩٨٧.

٢٤ـ بحث (دور الفكر الإسلامي في نصرة العقيدة بين الأمس واليوم) منشور بمجلة الكلية الزيتونية/ تونس، عدد: ٥. ابن هشام (عبد الملك بن أيوب، ت٢١٨هـ).

٢٥ـ السيرة النبوية، د. مكتبة المنار، الأردن ١٩٨٨.

# ناوەرۆك

# ژياننامەی دكتۆر عەبدولمەجيد نەججاڕ



– لە ٢٨ مايو ١٩٤٥ لە باشووری تونس لە دايك بووە.

– ماستەرو دكتۆرای لە زانكۆی ئەزهەر بەدەستهێناوە.

– مامۆستاو سەرۆكی بەشی ئوسولّی ئايين بووە لە كۆلێجی زەيتونييە لە تونس.

– لە چەندين زانكۆ وانەی وتۆتەوە لەوانە: زانكۆی عەممان، پەيمانگای زانستە ئيسلامييەكان، زانكۆی جەزائير، كۆلێجی بانگەوازی ئيسلاميی لە ليبيا.

– چەندين كتێبو لێكۆڵينەوەی هەيە لەوانە:

١– المهدي بن تومرت: حياته واراؤه واثره بالمغرب.

٢– تجربة التغير في حركة المهدي بن تومرت.

٣– العقل والسلوك في البيئة الاسلامية.

٤– المعتزلة بين الفكر والعمل (بالاشتراك).

٥– فقه التدين: فهما وتنزيلا.

٦– خلافة الانسان بين الوحي والعقل: بحث في جدلية النص والعقل والواقع.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیـەکی فیکریـی ئیـسلامیی رۆشـنبیری سـەربەخۆیە، لـە سـەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك - ١٩٨١ز) لە ویلایەتـە یکگرتووەکـانی ئـەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خالانەی خوارەوە بکات:

– فەراهـەمهێنانی تێڕوانینـی گـشتگیرانەی ئیـسلام، لـەپێناو تەئـصیلکردنی مەسـەلە هەنووکەییـەکانی ئیـسلام و روونکردنـەوەیان، هـەروەها لـەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییـەکان (الکلیـات) و مەبەسـت و ئامانجـە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممـەی ئیـسلامیی ئەویش، لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکـسازی لـە پرۆگرامـەکانی فیکـری ئیـسلامیی هاوچـەرخدا، بـۆ ئـەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خـۆی و هـەروەها رۆڵـی خـۆی لـە ئاراسـتەکردنی کـاروانی ژیـاری مرۆڤایـەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکـاریی هـەولو کۆشـشی زانـا توێـژەرەوەکانی زانکـۆ و بنکـەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لـەپێناو خزمـەتکردن بـە فیکرو مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبیی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لەڕێگەیانەوە کارو چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبیو ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش هەیە.